# جەغەتووی فرمێسک

کەسێک بە شوێن رووباردا بڕوا، دوو جاران بە دەریا دەگات.

(پەندی سوێدی)

نادر نیروومەند

نیرومند، نادر، ۱۳٤٥ ـ
جەغەتووی فرمیسک/ نادر نیرومند ـ تهران: پژوهنده، ۱۳۷۸.
۸٤ص **ISBN:964-6302-84-x**
فهرست‌نویسی براساس فیپا عنوان دیگر: جغتوی اشک (مجموعۀ شعر)
۱ـ شعر کردی ـ قرن ١٤. الف عنوان. ۹ ج ۸٤۳ گ/ ۳۲٥٦ **PIR**
۲۱ / فا ۸
کتابخانه ملی ایران ۹۷۹۳ ـ ۷۸ م

**ناسنامه**

**ناو: جەغەتووی فرمێسک**

**نووسەر: نادر نیروومەند «بۆران»**

**چاپی ۷۸**

**تیراژ: ۲۰۰۰**

**رووبەرگ: تابڵۆی کاک ناسر فەیزوڵڵابەگی**

**پیتچن: ناوەندی کوردەکا** شاسەنەم: ٦۲۲۱۳٤۰ جەوشەنی: ٦۲٤۲۹۲۱



**ناشر: پژوهنده**

**لێکدانەوەی ڕووبەرگ: ڕەنگە گەڕانێک بێ بە شوێن هۆڤیەتی بزربووی مرۆڤا!!**

# نێوەرۆک

## پێشەکی شاعیر

چـــــــەمی جەغـــــــــەتوو بـــــــدا بــــــــوارم
دەچمـــــــەوە ئەویـــــــەر بـــــۆ خزمـــــــەت یـــــارم

### خوا گیان بە ناوی تۆ

**پێشکەش بە دایکم رابیعە ناهید**

پیکاسـۆ وتوویـەتی مـن مـاچێکی دایکـم کردوومیـە وێنەگـەر. منـیش بـاش لەبیرمە لە تەمەنی حەوت ساڵی‌دا کـە پیـاو! هێـشتا کـوڕی دایکیـەتی! بـە هۆی نەخۆشی بە فەلەجی مناڵان، مەجبوور مام حەو مانگ دوور لـە دایکـم لە لە نەخۆشخانەیەکی تەورێز بکەوم. خەمی نەدیتنی دایکم لـە دڵـما بـووە گرێ‌پووچکەیەک کە دەستی هیچ فرمێسکێ نەیکردووە، هەتا رۆژێک دایکـم لــە بــەر پــەنجێرەی ژووری نەخۆشــخانە دیــت؛ چــون رۆژی چاوپێکــەوتن (ملاقات) نـەبوو نەیانهێـشت بێتـە ژوورێ و هـەر لـە بـەر پـەنجێرەی نزمـی نەخۆشخانەکەوە لایەک روومەتی ماچ کردم. ئەو شـەوە دڵـم نـەهات ئـەو لا روومەتەم بنێمە سەر باڵنجەکە و بە سەریدا بخەوم. بۆ بەیانیش سەروچاوم

**نەشۆرد. ئاخر لە باوەڕی منالّیما وامئـەزانی ماچەکـەی دایکـم لـە روومـەتم ئەبێتەوە! دوایی بۆم دەرکەوت جەغەتووی فرمێسکیش لی نەکردۆتەوە!**

**پێـشکەش بـە بـاوکم - ئـەوڕەحمانی نیروومەنـد - مامۆسـتای بەروپـشت ئەتلّەسی خۆشەویستیم کە کۆرپەی شـێعرم پـارووی خۆشەویـستی گـەل و عیشقی نیشتمانی لە دەس رفاند و زمانی گرت!**

**پێشکەش بە هەموو ئەوانەی:**

**- وا خۆشم دەوێن و نازانن**

**- خۆشیان دەوێم و نازانم**

**- لەگەڵ ئەوانەی وا یەکترمان - خۆش دەوێ و دەشزانین.**

## پێشەکی مامۆستا ئاسۆ

**بە ناوی خودا**

**ڕەنگە کەس بە قەت من لە شێعری «نادر» نەگا و هێندەشی لەزەت لێوەرنەگرێ. ئەم قسە نە بە مانای خۆهەڵکێشان و خوانەخواسە تاریف یا زەمە. هی ئەوەیە من و نادر لە ئاوی سەرچاوەیەک دەسنوێژی شێعرمان هەڵگرتووە و بەرەو یەک قیبلە نوێژی شێعریمان هەڵگرتووە و بەرەو یەک قیبلە نوێژی شێعریمان دابەستووە. جەغەتوو، سارووقامیش، پلەو بەردە، هاوینەڕێ، شای مەردان، چنارستان، کێو پشت باغ، برووسکە، شەتاو و... هەموو ئەو شوێنانە بوونە برووسکە و چەخماخەی هەست و ئەوینی ئێمە و بارانی فرمێسکی خەیاڵمانی لە عاسمانێکی بێئەستێرە و لە عەینی حاڵدا پڕئەستێرە هێنایە خوار. جا سەیر نییە لە هەموو کەس زۆرتر کوڵی دەروونی منی پێهەڵقرچێ. من زۆر جار لە نووسین و قسەکانما بەرانبەر بە کۆمەڵ و پرسیارگەرەکانم ئەوەم کوتووە و دیسانیش دووپاتەی دەکەمەوە. من بڕوام لە سەر شیعر وەک ئەو کەسانەیە پێیان وایە شێعری نوێ دەبێ بە فۆرمی نوێش بنووسرێ، هەرچەن دژایەتیم لەگەڵ قاڵبی تازە داهاتوو و نوێ نییە و زۆریشی لایەنگرم. پێشم وایە هەر کەس داهێنان و تازەگەری نەبێ شاعیر نییە، بەڵام بڕوام وایە هەر شاعیرێ نەتوانێ هەستی دەروونی لەگەڵ قاڵب و کێش و ئارایشتە ئەدەبییەکان تێکەڵ کا و دەریبڕێ، پێم شاعیرێکی بەدەسەڵات نییە. وەک ئەوە وایە کابرایەک بڵێ من خەیاتم بەڵام کراس نازانم بدوورم، یا نەشڵێ نازانم؛ بڵێ کراس دوورین باوی نەماوە، من هەر کۆت و شەڵوار دەزانم؛ بڕواتان بێ کۆت و شەڵوارەکەش خەسار دەکا.**

کێ هەیە بڵێ من نازانم گۆرانی بڵێم؟ هەموو کەس لە دەنگخۆش و ناخۆش کاتێ ویرەویرەکانی دەروونی زۆری بۆ بێنێ، یەک بە خۆی لە چۆڵییەکدا دەچریکێنێ و خۆشی پێی ناخۆش نییە و رەنگە ناخۆشیش نەبێ. بەڵام ئیدی ناتوانێ بڵێ من دەبمە حەسەن زیرەک، یان سەید عەلی ئەسغەر. شێعریش هەر وایە. خۆ هەموو کەس دەتوانێ شێعر بڵێ، بە تایبەت شێعری بێوەزن و قافیە. بەڵام بۆ هەموو کەس نابێتە نالی و مەولەوی؟ فەرقەکە ئا لێرەدایە. من پێم وایە هەستی دەروون کەسبی نییە، بە سەوادداری نییە، بە رەگەز و ریشە نییە، تواناییەکی دەرونییە لە بەعزە کەسێکدا سەر هەڵدەدا و لە بەعزێکدا نییە. دیارە هەر کەس ئەو هەستەی هەبێ ئەگەر لە گەڵیشی دەرس بخوێنێ و موتالا بکا زەریای بیرو ئەندێشەکەی قووڵتر دەبێ و کانیاوی شێعری قەت وشک ناکا و رۆژ لەگەڵ رۆژ لە زیادییە. جا بێتەعاروف من نادرم پێ لەو شاعیرە بەتوانایانەی کوردە کە دەتوانێ لە دەریای هەموو قاڵبێ بدا و... لە بواری تازەگەری شێعردا هەڵکشاوە. قەڵەمی نادر ئەگەر باسی مەسەلەیکی کلاسیکیش دەکا تارای بیرێکی تازەی بەسەردا دەدا. بڕواننە ئەم بەیتە:

هەست بە سەربەستی نەکەی؛ هەر دەس بەسەربوونە بەهەشت
باوە ئادەم سەردەمێک ئەی تووشی وەیلانی نەبوو؟

ئەم بیرە فەلسەفییە تازەیە، شێعر تازە دەکاتەوە. ئەو بۆچوونە تازانەیە دەبنە شێعری زەمان. چاو کەن خاڵ و زوڵف کە مەبەستی ساڵەهای شاعیرانە، کێ وەکوو نادری درکاندووە:

رازی دیلــی خــاڵ بــە تــای ئەگریجــە بــۆ کــەس هەڵــنەهات
قـــاتی زانایێکـــە بـــۆران ئـــەو گـــرێپووچکـــەم هەیـــە

وەنەبێ نادر هەر لە قاڵبدا شتی تازەی هەبێ، لە بواری شێعری تازەشدا هەر بە دەسەڵاتە. چاو کەن لەم قسە تازە بەم وشە کلاسیکانە:

سوێندم پێ مەخۆ فریشتە
خەرمان کەزیە زێڕینەکەت
دەستە خوشکی «ئاورکەدەکەی» زەڕدەشتە
نە شەجەرنامەم لایە و
نە لە مێژووشم بیستووە؛
ئەی نەتدیوە
چۆن لە سایەی بڵێسەی نەورۆزانە پێتبەخشیوە
مۆغئاسایی رۆحی شێعرم کۆیلەی گڕە و
هەستم بە ئاگر نەخشیوە

هیوادارم شێعرەکانی دەورانی کاملّی نادر کە قەتعەن کاملّتر دەبن، زۆرتر بگاتە بەر چاوی خوێنەران و چاومان وەک بەمان روون بوەوە بەوانیش روون بێتــەوە و قسەکەی منیش بسەلمێ کە نادر شاعیری زەمانی خۆیەتی.

بۆکان ـ ١٣٧٧/٨/٥

محەمەد سەعید نەجاری (ئاسۆ)

## زێڕوەشان

خــەم بــە تێبــینی ئــەوینت بــۆ دڵــم دەرمانــە دێ
تــا چپــەی هەســتی بەهەشــتت ســاقی لــەو لێوانــە دێ

رازی جوانی تۆی لە سەر لێــوە پــەرەنگی گــوێی فەلــەک
دوودڵــــی درکانــــدنی بــــێئــــۆقرە ســــەرگەردانە دێ

مانگی چاردەی رووت شەوێ گەر دێتە سەرئاسۆی خــەیاڵ
تــا بــەیان شــێعرم بــە دەوریدا وەکــوو خەرمانــە دێ

نــوێ بــەهاری مەیلەکــەت مــزگێنی چــی داوە بــە دڵ
هــەوری یــادت هــەر بــە ســەردا دێ هــەوای بارانــە دێ

چاوی هەستم جیلوەکەی جوانیــت کــە سەرمەســتی دەکــا
وەک شەفەق خوێنی لە جەرگ ئەتکێ، کەچی شــادانە دێ

قــژ لــە ســەر هەنیــەت پەرێــشانی شەماڵــە، یــا گوڵــم
فیلمــی رۆژانــەی ژیــانی مــن لــە کوردســتانە دێ؟

خاڵەکەی بــەر مــل دەگــەڵ قاقــا بــوو هــاودەنگی دەکــرد
وامئــەزانی قاسپەقاســپی کــەو لــە کــەژ، مەســتانە دێ

پــیری مەیخانــەی ئــەوین دەیگــوت دڵــی جــام راگــرن
خوڵکی دەستی کــەکرە بــێ چــارەی خــەمی ئینــسانە دێ

بیر و هۆش دەستەنگە خۆ بۆ زێڕوەشانی بەژنەکەت
گیان چ نرخێکی نەبوو هەرچیم هەبوو هەرزانە دێ

شۆقی یادی شێخی دونیا و دین گەیشتە تەشقی دڵ
خۆر بە ترپەی پێیەوە شانازی بەو هەستانە دێ

نەقشبەندی ژینی شەمزینانی عەشقە شێوەکەت
بەینی ئەم دوو چۆمی خوێنە شۆڕشی جانانە دێ

شەو بە تیشکی ڕوومەتت رازاوە کۆڕی پەرپەرۆک
کازیوەی ئازەڵ هەتا شێوی ئەبەد ئەفسانە دێ

خۆزگە دەمزانی کە شێعری ئاوڕت چی گوت بە کەژ
تۆزی گڕ هێشتا لە کفنی ئەم کل و کلدانە دێ

فاڵە شێعری ئەم شەوەی بۆرانە فرمێسکی غەزەل
زوڵمەتی کەزیەت لە سەر لاجانگ بەیانبەردانە دێ

۱۳۷/۲/۱۵

## لەو ساوە

خۆرەتــاو دەرکــەیی لــێ پێــوەوە داوم بــە غــەوس
گوڵــە لــەو ســاوە لەگــەڵ ئێــوە نــەماوم بــە غــەوس

چاوەکەم ڕێشکەو پێشکەی بــوو لــە دەوروبــەری خــاڵ
ئەڵــقەی ئەگریجەکــەتم دی حەپەســاوم بــە غــەوس

گەر لە خاڵی سەری کوڵم و ڕەشــیی مــووت وردەوە بی
تێدەگەی چۆنە لە سۆت جەرگ و هــەناوم بــە غــەوس

لام نــەبی ڕۆژەڕەشــم، دڵ بەخەشــم، شــینە بەشــم
کاتــێ لامــی گەشــم و دێتــە دی کــاوم بــە غــەوس

نــاوی تــۆ خۆشــترین هەڵبەســتی ســەری لێوەکەمــە
چاوەکــەت چاوگــەیی بــێوێنــەیی چــاوم بــە غــەوس

هەرچییــەک چــاو لــێدەکــەم وێنــەیی تــۆی تێدایــە
بۆیــە ئێــستاکە جیهــان بۆتــە گــراوم بــە غــەوس

هــەر دڵ و دیــدەیی بۆرانــە نەشــەمزین بــە ئــەوین
ئاســۆ خــوێن گــرتی لــە ئەســرینی ڕژاوم بــە غــەوس

ڕەزبەری ١٣٦٥

## کۆیلە

کۆیلە بووم کۆیلــەی هەمیــشەی هێنــدە راڕایــی نــەبا
هــەر زوێــنی[1] داوی عیــشقی بــووم لــە خۆبــایی نــەبا

تاقــە پەروانــەی پــەڕوباڵ هەڵــوەریوی دەوری رووی
دڵ دەبوو گەر ئــەو شــەمی هــەر کــۆڕێ ئاســایی نــەبا

ئاوێنەی ژینم گەلێ رووخــۆش ئــەبوو و شــادی‌نــوێن
گــەر بــە غــەوری بــێوەفــایی ژەنگــی بینــایی نــەبا

خۆری هیــوای رۆژی وەســڵی کــوا لــە دڵ ئــاوا دەبــوو
دا جــودایی بــۆ ژیــان شــەوگاری تــەنیایی نــەبا

پاشی خــۆی ئێــستا خــەمی شــیاوی هەڤاڵــی دیتــووم
چۆن شیاوی ئەو خەمەی بام و بــە خــۆم شــایی نــەبا

دەوڵەمەندی گــەنجی عیــشق بــووم و ســامانم هــەبوو
رەنجــی دڵ پــاکی ئەگــەر بــێسوود و خــۆڕایی نــەبا

خــۆ دەزانم قــەت بــەهاری بــێخــەزان نــەبووە بــەڵام
چی بوو بۆران ئــەو بــەهاری عیــشقە کۆتــایی نــەبا؟!

١٣٦٨/١٠/١٤

---

[1] ـ زەبوون، نزار، بێدەسەڵات.

## هێشتا

رۆیـــی نـــا ، یـــادی نـــەڕۆییوە لـــە دڵ هێـــشتاکە
ئـــەوکمی گرتـــووە گریانـــیٚ بـــە کـــوڵ هێـــشتاکە

ئـــەز ســـیامەندم و ئـــازاری خـــەمت دارەبەنـــە
ســـینگی شـــەق کـــردم و گرتوومیـــە چـــڵ هێـــشتاکە

دەستی جەرگم هەموو هـەر خوێنـە بـە کێـی بنـوێنم؟
بـــێدڕک نـــەبوو هـــەتاکوو بـــووە گـــوڵ هێـــشتاکە

باڵی بـە برینـە لـە بـەر بـەردی جـەفات کـۆتری دڵ
چییـــە ئـــەم جـــادووە وا لێـــت نییـــە سـل هێـــشتاکە

هێند ئـەوین داخـی بـە نـاو دڵـمەوە نـا تـا پەسـڵان
پۆلـــە خاشخاشـــەیە کـڵپەی دێ لـــە گـڵ هێـــشتاکە

وەک خـــەلیل تـــاوێ شەماڵـــی بەزەکـــەت لـــێم هەڵـــکا
گەشـــتی گوڵـــجاڕە بـــە رۆحـــم خـــەمی کـڵ هێـــشتاکە

خوایـــە بیبـــووری لـــە خۆبـــایی نـــەبووبێ بـــۆران
کـــە وتی عیـــشقی لەمـــەی مـــەی نـــەدی دڵ هێـــشتاکە

١٣٦٨/١٠/٢٠

## کۆچ

زەردەخەنـــدەی ئاشــکرایە و شــینی ون تــەوری دڵــم
دیوی دەرخۆرە و لە ژووریٚ کـەیلی نـەم هـەوری دڵـم[1]

کــۆچی ســوورت کــانیی هەســتی کردمــە ئاتەشــکەدە
ئــاوری هــەرچی خەمــە کــۆی کــردەوە گــەوری دڵــم

هەڵدەهێنیٚ ژەنگی خەم بیٚشک ئەگــەر بێتــوو چــەلێک
رێژنـــەی تێــزابی ئەســـرین نەیـــسڕیٚ غـــەوری[2] دڵـــم

قەت نەبوو بیٚخورپە داساکێم لە پێــی دونـدی خــەیاڵ
لێم یەقینە گیــان وەدەر نابــەم لــە دەس بــەوری دڵــم

خۆشە سەربەستی بــەڵام چ بکــەم بــە کـۆتی ئەڵــقەوە
بۆســـەیی[3] ئەگریجـــە ئاســـان ئەیتـــەنیٚ دەوری دڵـــم

هـــەر دەبـــیٚ راژیٚ بـــە داری ناهـــەقی ئـــازارەوە
بێــژە ســازی کــەن لــە چاڵــی گــەردنت قــەوری دڵــم

بۆ مەگــەر بــۆران ئــەوین تــاوانی ئــاوا گــەورە بــوو؟
ژیلـــەمۆی ژانی لـــە ســـووچی دۆژەهـــی جـــەوری دڵـــم

---

1 – بەیتی ئەوەڵی ئیلهامەکەی لە شێعرێکی «هروی» وەرمگرتووە:

خندە می‌بینی ولی از گریەی دل غافلی  خانە ما اندرون ابر است و بیرون افتاب

2 – ژەنگ

3 – کەمین

## ئاوا

دڵــەکەم نــوقمی خەمــە و دیــدە لــە ئــاوا ئاســۆ
هــیچ ئەکــەی یــادی وڵات و مــنی ئــاوا ئاســۆ

نــەبوو جــاران وەکــوو ئێــستاکە مــەکۆی تــەم دێکــە
خــۆت ئــەزانیت و چیــای دڵــگر و ئــاوا ئاســۆ

دێتــە بــیرت خــۆ گــەڕی ڕەشبەڵــەکی کیــژ و کــوڕ
هــەر لــە بوولێــڵەوە تــا ڕۆژ ئــەبوو ئــاوا ئاســۆ

هێنــدە بــەرچاوی ئومێــد نووتەکــە بــیر هەتــڵە دەکــا
ڕوونی نــابینی لــە نــاو کــانیی هــەتاوا ئاســۆ

«پــیر موحەممــەد»[1] کــە دەبــینی دڵــی هەڵــقرچاوە
کــۆچی ســووری شــەفەقی دیــوە هــەتاوا ئاســۆ

وا ئەوینــداری لــە بــیر بــردەوە ســامی ڕەشــەمە
مەیلەکــەی نــاوی گــەزیزەی حــەزی ســاوا ئاســۆ

وەمدەزانی کە بەهارە و دەبــێ خــۆش بــێ کــەژ و کێــو
ســەیرە ئــەم ســەردەمە بۆرانــە لــە ســاوا ئاســۆ

---

[1] – چاکێکە لە سەر کێوێک هەر بەم ناوە بە پشت ئاوایی سارووقامیشی بەهی فەیزوڵڵابەگییەوە، خەڵک بۆ نیاز بە تایبەت باداری دەچنە سەری، گڵکۆی زانای موسوڵمان حاجی برایم خانی سەلاح لەوێدایە.

## چە خماخە

ئەو یەکـەم سوورەگوڵـی پەڕپـەڕی ئـەم شـاخە نییـە
کێ دەڵـێ کۆسـتی گـرانی ئـەم خـەوی چاخـە[1] نییـە

خۆ لە مێژە بـە زووخـاو جـەرگی مـە زاخـاوە بـەڵام
ئاخ کە هیچ داخێ لـە ناخا وەکـوو ئـەم داخـە نییـە

دەشتی دڵ گـشتی شـەقارە بـە سـەبوونی خەمەکـەت
وەشتی ئەسرینی مە، خۆ مەڵـهەمی ئـەم ناخـە نییـە

پیـــشەمانە بـــە ژیـــان وەرزی نـــەهاتی بکـــوژین
تـــاکوو پـــشکووتنی بـــێبڕانـــەوە لـــەم باخـــە نییـــە

هـــۆ گـــەزیزە زەوی بـــۆ وەرزێ بەڵـــێنت پـــێدا
عاسمانـان دەگـەڕێ تـا لـە سـەر ئـەم ئاخـە[2] نییـە

خەنـــدەکی کۆشـــکی هومێـــدت لـــە دڵا وا دارشـــت
بوومەلەرزە بـە خـەویش تێکـدەری ئـەم کاخـە نییـە

هەوری ئـەو شـاخە بـە بـۆرانی لـە گـۆڕان ئەگـەڕێ
شاخەکەی[3] هەردی لەران ئەی کەشی چەخماخـە نییـە

سەقز ـ ١٣٦٩/٤/٢٢

---

[1] – سەردەم، زەمان
[2] – خاک
[3] – دەنگی گەورەی رووخانی چیا، شریخەی هەور

## ئاوڕ

پێشکەش بە موردای دڵە موریدەکەم
سەید فاڕووقی گەیلانی زادە
کە تا پەسلان شەرمەندەی ئەو فرمێسکانەیم وا بۆ من ڕشتی.

**پەتی سێدارەی ئازارێ گەرووی هەستی گوشیم ئەمشەو**
**وەکوو مۆمی شەوی یەلدا بە کڵپە هەڵوەشیم ئەمشەو**

**هەنسکی بێپشوو بوو، ڕایەژاند ئەستێرەکان گەردوون**
**دەچوو پشتی هیلال شەق بێ لە حەیفی بێبەشیم ئەمشەو**

**عەسا، کەشکۆڵ و کاڵەی ئاسنینم لێ شەق و پەق بوو**
**لە پشت قافیش نەبوو مەجزووبی یادێکی کەشیم ئەمشەو**

**بە ڕۆژا گورگەزێ بوو عاسمانی ژینی سامگرتوو**
**لە قاقای هەوری یاد و شیوەنی دڵ ڕاوەشیم ئەمشەو**

**لە بێستوونی ئەوین ئێستاکە وەک فەرهادی ئەم چاخە**
**بە نیوە گیانەوە لاشەی ڕەهێڵی باوەشیم ئەمشەو**

**بە تاجی شاهی و گەنجینەکەی قاڕوون گەمەم هاتێ**
**لە سایەی گەوهەری فرمێسکی دوو چاوی خەشیم ئەمشەو**

**نیازم وابوو بە «دزە» باسی «شەمزینی» دڵت لا کەم**
**کە ڕوانیم خۆت کوڵی گریانی بەو دەردەی چەشیم ئەمشەو**

**برووسکەی ئاوڕی دوێکەت لە «بۆران» جۆگەی ئاور بوو**
**تریفەی مانگی هەڵبەستێکە بۆ چارەڕەشیم ئەمشەو**

سارووقامیش ـ سەرماوەزی ١٣٧١

## هاواری فرمێسک!

ئەرخـــەوان ســووری بـــەهارە جەغـــەتووی فرمێـــسکم
ئـــەوی ســامانی مـــە بـــوو بـــردی هـــەمووی فرمێـــسکم
ژیلـــەمۆی دۆژەهـــی[1] بێـــدەنگی دەروونـــە دڵـــەکەم
تاقـــە هانـــای مەیـــە هـــاواری گـــەرووی فرمێـــسکم

چـاوی یـادت کـە لـە سـەر لانکـی دڵـم خـەونی زڕا
نـەبوو کەڵـکی هـەچی داپۆشـی پـەتووی فرمێـسکم

شـەوی مـەش چـاوی رەشـی کاڵـەوە بـوو زانیبـام
تاریـــــکوڕوونی دڵاوا بـــــوو دەرووی فرمێـــــسکم

شـەرح و تەفـسیری مـەعانی لـە سـەر ئایـاتی دڵـە
بۆیـــە تـــا بوومـــە زمـــان لاڵـــە دەڕووی فرمێـــسکم

روح لە مەزراکەی ئەوین مـانوو بـوو تـا هاتـە دەسـم
سکـڵی یـاقووتی دڵ و گەوهـەری فـووی فرمێـسکم

کەس وەکـوو مـن بـە وەفـای عیـشقەوە رسـوا نـەژیا
ئەی فەلەک بەردی جـەفا مـەگرە سـەبووی فرمێـسکم

بـاخی ئـاواتم هـەچی تووشـی سیاساڵـی دەبـێ
مـوعجیزەی پـاکی مەسـیحاییە هـووی فرمێـسکم

نوخـشە داهـات و لـە تەنگانـە بـەڕێ بـووی بـۆران
بەرهـەمت گـرتی لـە سـایەی بنـەتووی فرمێـسکم

سەرماوەزی ١٣٧١ ـ بۆکان

---

[1] – دۆزەخ

# پەژارە

پـــــــەژارەم زەردی پاییزانـــــــــە ئەمـــــــــشەو
خــــــەزانم کــــــۆچی ئازیزانـــــــە ئەمـــــــشەو

دوو چـــــــاوم وەک پیاڵــــــــەی گوارەکانـــــــت
پـــــــەرەنگی ئەشـــــــکی ئاوێزانـــــــە ئەمـــــــشەو

هـــــیلال ئـــــەبرۆ! خەیاڵـــــیش تـــــا تـــــەرازووی
ئـــــەتۆ و مـــــانگی لـــــە نـــــاو میزانـــــە ئەمـــــشەو

لـــــە بـــــادەی عیـــــشقەوە دڵ گـــــرتی جامێـــــک
بـــــە مەســـــتی حەشـــــر ئـــــەبێ بیزانـــــە ئەمـــــشەو

دڵـــــی بێـــــستوون هەڕۆڵـــــی ئێـــــشی ناڵـــــەم
هەراســـــان بـــــیری پەرویزانـــــە ئەمـــــشەو

لـــــە ســـــووچی نووتـــــەکی بـــــێهـــــاودەمیدا
جیهـــــان پاتـــــەختی لـــــێم زیزانـــــە ئەمـــــشەو

گـــــزەی رێـــــویم ئـــــەدی درگـــــای بـــــە شـــــێر گـــــرت
کـــــەڵ ئـــــاوارەی دەهـــــۆی حیزانـــــە ئەمـــــشەو

بـــــە شـــــاخی عیـــــشقەوە بـــــۆرانی دامـــــاو
نیـــــشانەی گوللـــــەیی تیزانـــــە[1] ئەمـــــشەو

[1] – تانە، تەشەر

## شاهید

کــش و مــاتی تەڵــەکەی پەرچــەم و خاڵــە دڵــەکەم
کــەڵ بـــە مــوو بەنــدە و ئــازادی مەحاڵــە دڵــەکەم

ئــەز نــەبێ کــەس بــە هەوایێکــەوە تــا ســەر نــەژیا
تــا بــووە تاعــەتی بــۆ چــاوی کەژاڵــە دڵــەکەم

چاو بە تــەزبێحی تکــەی ئەشــکەوە دەســتی بــە دوعــا
شـــاهیدی گرتنـــەوەی فاڵـــی بەتاڵـــە دڵـــەکەم

بــە گزنگـــی دەس و پەنجــە شــەوی زولفــت لابــە
شــێت و شــەیدای فەلــەقی روومــەتی ئاڵــە دڵــەکەم

زەردەخەندەت بە جلی ســووەرەوە دەســتی دڵــی گــرت
گــەڕی ســـەرچۆپییەکەی ئەشـــقی خەیاڵــە دڵــەکەم

وەحیی عەشقە و لە کەو و عەرشەوە نازڵ بــوو نیگــات
کــۆڵ بــە بەرماڵــی خــەم و لــەرزی هەڤاڵــە دڵــەکەم

چەمی ئاسـۆی بــە گزنــگ رشــتووە کلچێــوکی بــەیان
لـــەوە بـــۆران ئەبـــەدی بـــانگی زولاڵــە دڵــەکەم

ئەشــقی نیلووفــەری ئــەو چــاوە کــەڕاماتی نوانــد
وا فـــڕی گـــەرچی مـــەلی بـــێ پـــەڕ و باڵــە دڵــەکەم

١٣٧١/١٠/١٥

## خەزانی زەردە

بــەهارە و بولبــولی شــەیدا ئــەبینم هــەر کــش و مــاتی
بــزەی گــوڵ نەیترازانــدی گرێــی دڵ بــۆ مەگــەر تــاتی[1]؟

ئەشا شیرین زمــانی سوێــسنە و شــۆخی نیگــای نــەرگس
پــــەژارەت بۆچییــــە وا هاتــــە بــــەر دڵ بــــاخی ئــــاواتی

زەویم سەرخۆشــی شــەنگی دیتــووە ئــەورۆ لــە شــادی‌دا
فەلــەک مەســتانە جــام ئــەگرێ وەکــوو پــیری خــەراباتی

کەچی ســێ تــاری سینــەت زایەڵــەی میــزرابی بــێ‌دەنگــە
نەشــە بــەم بەزمــە نــادا ســۆز و ئاهــەنگ و مقامــاتی؟

گوتی بولبول: خەزانی زەردە بوو ئەم وەرزە بــۆ گــەش بم؟
کــەوا رەشپۆشــە ئــەورۆ خەڵــکی موڵــکی دڵ حەشــاماتی

چەمەرچۆپی خەمی شــێعرە لــە شــینگەی نــاخی شــاعیردا
لە گــوێنی کوێنــە دەسرۆکەی کچــی چاومەســتی عــێلاتی

بــە بوولــەرزەی هەواڵــێک شــاری وێرانــە دڵــی هــەموان
لــە هــەولێر و ســنە و بۆتانــەوە تــا دەشــتی شــاماتی

لە مێژە کۆست لە شوێنی کۆستە لەم کوێستانە رەشپۆشــە
لــە کــۆچی تاڵــی خاڵــەش‌دا ژیــاوە لی بەســەرهاتی

١٣٧١

---

[1] – تاشە بەرد، بەردە تات مردووی لە سەر دەشۆن.

# ئەفسانەی دڵ

له دەستم دەرچوو دەستەڵاتی دڵ[1]
دەستە ئەژنۆ مام، کش و ماتی دڵ

دڵ ڕۆیینی ڕۆی نەگەڕایەوە
چاوم سپی بوو بە هاتهاتی دڵ

له شاری ئەوین کەڵ بە موو بەندە
دەستم شۆردەوە له نەجاتی دڵ

دڵ هەدای نەدا و هەر هەڵوەدا بوو
پەندی بە من دا بێسوباتی دڵ

کۆشکی ئارەزوو تا عەرشی دەچوو
خاپوور نەبا زوو لێم وڵاتی دڵ

«کە بە جێت هێشتم، ژیانت کوشتم»[2]
چ دڵتەزێنە کارەساتی دڵ

دوای ئەو خەسارە ساویلکەم ئەگەر
کوورم کا باری بەردە تاتی دڵ

فرمێسکە شەونم زامە گوڵاڵەی
شیوەنە هەوای شۆرەکاتی دڵ

له هەرچی بدوێی کۆتایی پێ دێ
غەیری ئەفسانەی بەسەرهاتی دڵ

تاسەی دڵ مەگەر له گڵ نێ بۆران
جا نەجاتی بێ له ئاواتی دڵ

---

1 – ئیلهامی ئەو غەزەلە لە شێعرێکی فارسییە: از کفم رها شد مهار دل

2 – هی شاعیرێکی کوردە، نەمناسی. «نەک جێت هێشتم، ژینت کوشتم»

# بەهانە

شیرینە بەهانە لە تۆ
کوا دڵ دێشێ گیانە لە تۆ

تۆران و زوو ئاشتبوونەوە
هەموو شتێ جوانە لە تۆ

چەتری لێ تێک دەچێ تاوس
دەرکەوێ پاوانە لە تۆ

بیرەبیرەی[1] کارمامزیش
لاسای ئاوڕدانە لە تۆ

مانگی سۆرانی و خەرمانەش
هۆنراوە و پەخشانە لە تۆ

وەک داوە شەعری نالییە
چۆپی ئەم دیلانە لە تۆ

خەرمانی هەستیم گڕ دەدا
نیگای ئەو چاوانە لە تۆ

بە نیازی نازێکت بمرم
بۆم تازەیە ژیانە لە تۆ

[1] – هەڵوێس هەڵوێس، راکردن و وەستان و ئاوڕدانەوەی مەڕەکێوی و مامز.

وا رموودەی ئازارت بووم
بەزەم پێ تاوانە لە تۆ

ئێش و نۆش کە بە نۆرە بێ
دەردم بۆ دەرمانە لە تۆ

خەڵکی کوشتەی ئازادی و ئەز
رزگاریم زیندانە لە تۆ[1]

سۆزی گەلاوێژ کەوتنە
ژینی گوڵ گریانە لە تۆ

عەشیرەتی پەپوولە و گوڵ
کەسیرەی زریانە لە تۆ

حەماسەی شەمزینی دڵان
شێعری دوو ئاوانە لە تۆ

ئاسۆی ژین شانازی دەکرد
بەو بەیانبەردانە لە تۆ

بەفرە بۆرانە شاری دڵ
خۆشە رێبەندانە لە تۆ

بڕوانە مانگی یەکشەوەی
رووناک موکوریانە لە تۆ

---

1 – ئیلهامەکەی ئەو تاکە شێعرەی حافزە کە دەڵێ: من از ان روز که در بند توام ازادم.

دوانـــــــزە گـــــەزیزەی ســــــیا ســـــاڵ
پۆیلـــــــە و نەورۆزانـــــــە لــــــە تــــــۆ

چـــــرای بـــــیر بـــــە چـــــوار چـــــاوەوە
ڕێ دەگـــــرێ بـــــە تانـــــە لــــــە تــــــۆ

چیرۆکـــــــــی ئەوینــــــــدار کـــــــوژی
پـــــــڕی کوردســـــــتانە لــــــە تــــــۆ

کــــــەچی ڕۆحـــــــم بـــــاوەڕ ناکـــــا
بـــــەو دەس لێـــــکبەردانـــــە لــــە تــــۆ

هەرچـــــــەن بەڵــــــێنی کوردانــــــەم
نـــــەدی بـــــەو قورعانـــــە لــــە تــــۆ

گـــــڵیش لــــــێم نابیــــــسێ بـــــڵێم
گازنـــــــدەی بۆرانـــــــە لــــــە تــــــۆ

ساروو‌قامیش ـ ٣٠ بەفرانباری ١٣٧٤

## پیاسە

ڕووناکی دڵی ئێمە دە تۆخوا بگەڕێوە
چۆن ڕۆیوی لەم شارە هەر ئاوا بگەڕێوە

ئەرخەوان سوورە بە دووی کۆچەوە ئەسرینی چەمم
تا ئێرە بە فرمێسکی ڕژاوا بگەڕێوە

ئەنگوستی خەیاڵت بە هەوایە دڵی بزواند
هۆی سەوزە بە شمشاڵی شەتاوا بگەڕێوە

لەو ڕۆژەوە بۆئۆقرەیی نەورۆزە گەزیزە
وەک چاوی بە ڕێگاوە نەگوروا بگەڕێوە

تۆ ڕۆژی هەوەڵ دەستی وەفات نایە دەسی من
ئەمڕۆکە بە سەر قەولی شکاوا بگەڕێوە

لێوی گوڵەباخ خونچەیە بۆ ماچی هەتاو، تۆش
بۆ ژوانگە بە ناو بۆنی گوڵاوا بگەڕێوە

ئەی بێنی کەزێی یار شنە تاڵانی دەکردی
بۆم لە بری هەناسە بە هەناوا بگەڕێوە

هێدی بووە بۆران و چیام خاڵە بەڵەک دیت
بە پیاسەیی بەفری نەتواوا بگەڕێوە

١٣٧٥/١٢/٢٥

# سەوزەڵێ

خۆشەویستیت شا چ کارێکی لەگەڵ من کردووە
هەر لە ڕێی ژوانگەی یەکەمدا دەست و پێم ون کردووە

بۆ خەنەبەندانی پەنجەی خوێنی جەرگی لێم ئەویست
یار بە ئێمەی کرد ئەوەی بڕوانە دوژمن کردووە؟!

دڵ بە پێشنوێژی لە میحرابا ڕووەو سوژدە ئەڕۆی
تاقی ئەو برۆ چۆنی ڕووگە پێ سەروبن کردووە

تا بە سەر گەنجی خەمتدا کەوتووە چاوی خەیاڵ
ڕەنگی زەردم قۆڵی ژینی پڕ لە بازن کردووە

گشت لە سایەی سەوزڵێکەی بولبولە ناوبانگ گوڵ
ڕۆحی چەوساوەی زرێ بەستێنی هێمن کردووە

مێزەری بەفری سپی زستانە با بردوویەتی
بۆ بە وەعزی سەدی هەردی فێرە مردن کردووە؟!

ئاوری نەورۆزە گرپەی دێ لە کۆگای هەورەوە
لەقلەقیش دەندووکی بۆ دەسڕێژە زامن کردووە

هات هەناسەی سروە بۆ ماچ خونچە بوو لێوی چرۆ
ڕێی دەس ئەگرێ گوڵ بەرۆکی دەرزی ئاژن کردووە

بۆ بەهار ئەشنایەوە بسکی گەزیزەی بێحیجاب
زانی بە ڕیا وشکە سۆفی خۆیی کوڵکن کردووە

سێروو دەروێشی بەهارە و باڵی لێدا وەک دەفە
جەزبەیەک گرتوویە بانگی ئاوەزی گن کردووە

گوڵ سەری داخست ڕوە و فێرگەی بەیان هەنگاو ئەنێ
لەچکەکەی سەوزی ئەوەندەی کەیشی گووپن کردووە

دێ بە لاسایی سوپای بێگانە ئەورۆ بای شەماڵ
بۆ عەتر بوخچەی گوڵانی کوڵکە پشکن کردووە

کیژی گوندی کوردەواری بوو جەڕەی ئاونگ بە شان
هەستی تەنیایی وەنەوشەی زێدە شەرمن کردووە

کەوتە بێشکەی خاکەلێوە خونچە سروەی دێ لە دوور
کۆرپەیە و بۆ باوەشی دایەی شنەشن کردووە

تا سەری ڕوانینی پەرژاوە بە جارێ لەم کەژە
چاڵی گۆناکەی گوڵی بۆرانی عیشقن کردووە

١٣٧٥/١٢/٢٣

## بەرهەمی حەز

بەرهـــەمی وەرهەمـــە حـــەز تـــاکوو بـــووە هـــەر وا بـــوو
دەمـــێ گـــوڵ پێکـــەنی بولبـــول بەشـــی واوەیـــلا بـــوو

نـــاخی ئەســـتێرە لـــە ســـەر کێـــشی هەنیـــسکان ئەهـــەژا
بـــە کـــزەی شـــێعری ئەوینـــداری زەوی گریـــابوو

وەک تنۆکێکـــە لەبـــەر چـــاوی دڵـــی کـــەیلمدا
ئـــەوی ئەفـــسانە لـــە لێمـــشتی شـــەوی زەریـــا بـــوو

پـــشت بـــە بـــا بەســـتنە دڵخۆشـــی لـــە ســـەر ئـــەم هـــەردە
بـــە تـــەنێ مـــاوە ئـــەوەی خـــزم و کەســـی دونیـــا بـــوو

هـــەر گوڵـــی داخ و جـــەخارم لـــە دەروونـــا پـــشکووت
بـــۆ مەگـــەر ســـنگی مـــن ئـــەی خوایـــە خەفـــەتسارا بـــوو

شـــنە کـــام رازی بـــە گـــوێی شـــۆڕەبییا داوی وەهـــا
جەزبەیـــەک گـــرتی لـــە ســـەر شـــانی کـــەزێی تاتـــا بـــوو

کـــۆڕی زیکرێکـــە لـــە مزگـــەوتی موریـــدانی ســـەما
شـــەو پەرێـــشانە قـــژی مانـــگ دەفەکـــەی هێنـــابوو

خاڵـــەکەم ناســـی لـــە ژێـــر ســـێبەری ئەگریجـــە کـــەچی
بـــە دەنـــووک پێـــوە دەبـــێ ئـــەو مەلـــە وا وریـــا بـــوو

ســـروە تاڵـــێکی لـــە بـــسکی بـــە رووا ئەڵـــقە دەکـــرد
بـــۆ «هـــەلاجی» دڵـــی بێچـــارە پـــەتی هەڵـــدا بـــوو

بـــەو کـــەژ و کـــۆوە لـــە ونبـــووی دەگـــەڕێ تـــا مـــاوە
رۆژی ئـــازەڵ بەشـــی بـــۆرانی خـــوا وا دابـــوو

بۆکان ـ ١٣٧٥/١٢/١١

# خەون

گوڵــە لی جوانــە لــە ســەر چۆپییــا بــادانی لــەچک
شـــەونمە ئـــارەقی لاجـــانگی خـــزا مـــەم تکـــەتک

«بزەیەک بتگــرێ بــا کۆشــی نیگــام پــڕ بــێ لــە گــوڵ
منی بێچارە لــە خونچــەی دەمەکــەت کــەم بخــە شک

پــی وتم رۆژێ بــە شــێعرانە دوو ماچــت دەدەمــێ
ساڵەوەختێکە، نە دووی دیت و نە یەک لێــوی وشــک»[1]

شەونــشینی لەگــەڵ ئــەو چــاوە خــەوی دڵــمی زڕانــد
تــازە نایکــا بــە شــەو هەرچەنــدە بــدەی باوێــشک

چــاوی شــۆفار بووەتــە دڕکــی مــەم و زیــن لێمــان
درەک و دیــواری زەمــانی هــەموو پــڕ کــرد لــە مــشک

دوژمنان پێکــەوە ئەوڕۆکــە بــە شــوێن ئێمــەوە بــوون
سەیری بەختی کەچی مە کتک و مشک بوونــە خوشــک

ئــاوی نامێنــێ ئەگــەر پێــی چــووە ســیروان دڵــەکەم
ئەی لە ســاڵا جەغــەتووی رۆنــدکی بــۆ نابــێ وشــک؟

شای ئەوین کاتــێ گــڕ و گەوهــەری گێــڕا بــە کەشــەف
دەسی دڵ ئــەو بــە شــەوا پــەنگرە[2] خــستوویە پــشک[3]

خــەونی ئەگریجەکــەتم دیبــوو بــە بۆرانــەوە هــات
هــەر لــەوێ رۆژەوە شــەمزین دڵ و گیــانم بــە ئەشــک

١٣٧٥/١٢/٢٠

---

[1] – ئیلهامی ئەو دوو بەیتەم لە حافزەوە وەرگرتووە.

[2] – پەشکۆ

[3] – قورعە

## سەفەری فرمێسک

فیلمـــی یادێکـــت ئەگـــەر دێتـــە بـــەری فرمێـــسکم
ســـەری دڵ ســـوورە لـــە ســـای وێنەگـــەری فرمێـــسکم

چاو بە خۆڕایی دەبەخشی بەم و بـەو دڵ دەسـی خـست
هـــەر تنـــۆکێکی بـــە ســـەد کـــوێرەوەری فرمێـــسکم

ڕەنجی برد ئەم دڵە تـا گـەنجی حـەزت کـردی خـەڵات
تـــا دەســـی ڕۆیـــی دڵ ئاســـان ئـــەوەری فرمێـــسکم

کەوتـــە کۆشـــی گـــەدایی هیممـــەتی ئاغـــایی دەدا
هەرچیـــەکم هەیـــە لـــەو بـــوو، نۆکـــەری فرمێـــسکم

شـــەوچرایەکە ئـــەوین تـــاکوو لـــە ژیـــندا دەگـــرێ
بـــە پەپوولـــەی دڵـــەوە تـــۆزی دەری فرمێـــسکم

خۆڵی خـەم گـرتی بـەری دیـتنی ڕۆح بـۆ مەلـەکووت
ئـــاوپژێنی لـــەوە کـــرد ڕێـــی ســـەفەری فرمێـــسکم

بـانگی شەونالـەم ئەگـەر تـۆزێکی تـر واوە ئـەچوو
کاکەشـــان تەختـــە دەبـــوو بـــۆ هونـــەری فرمێـــسکم

بـاخی ئـاواتی مـە بـۆ هـەرچی هەوایـەک نەشـنا
بـــێنیـــازی لـــەوەتی بۆتـــە بـــەری فرمێـــسکم

کام گرێ پووچکە لە خەم کەوتە گلۆڵەی دڵەکەم
هاتە هانای بە کەرەم دەستی پەری فرمێسکم

شای ئەوین کاتێ بە جەژنانە خەڵاتی خەمی دا
گەوهەری ناردەوە بۆ تاجی سەری فرمێسکم

وێڵی بێعیشقیە کانی رەشی چیرۆکی ژیان
چاوی پێنووسی سپی بوو کەسەری فرمێسکم

شێعری من وشک و تەڕی پێکەوە سووتاند لەوەتی
گڕی ئاخت بووەتە هاوسەفەری فرمێسکم

تا نەیارم کەسی خۆمە گلەییم نەبووە لە دژ
خوێی برین و چڵەکانە تەشەری فرمێسکم

کۆچی سووری دڵی هێند دیوە بە چاوی بۆران
دوایی نایە غەزەلی بیرەوەری فرمێسکم

١٣٧٥/١٢/١٩

## چەمەڕا

شـــەو بـــە چیرۆکـــی خـــەمم ڕەنگـــی بزرکـــاوە وەرە
وەک بـــــەیانی چەمـــــەڕا چـــاو نـــــەترووکاوە وەرە

شـــەرح و تەفـــسیری هـــەبوو دڵ بـــە زمـــانی ئەســـرین
کـــام حەدیـــسی لـــە ســـەبر بۆمـــە نەگێـــڕاوە وەرە

بـــیرم هێنـــد شـــێوەتی هێناوەتـــە بـــەر چـــاوی خـــەیاڵ
ڕوو لـــە هـــەر لایـــە دەکـــەم وێنـــەتی لـــێ داوە وەرە

بـــا بـــە ســـەرکۆنە بـــڵێن کۆنـــەکا ئـــاگر نـــەگرێت
پـــیری ڕســـوا بـــە ئـــەوین بـــاوە دەڵـــێن لاوە وەرە

شـــەڕەبای پـــایزی تـــاڵانی دەبـــرد ئـــەوڕۆ لـــە بـــاخ
قەڵـــەمی ســـەوزی چـــرۆ بەرهـــەمی رووتـــاوە وەرە

کاکەشـــان چـــاوی گـــەلاوێژی خـــەمین شـــەو دەنوانـــد
گـــوڵ بـــە بـــێنـــاز ئەکـــەوێ بولبـــولی تـــاراوە وەرە

جەژنە ئەو مەرگە لـــە ســـەر باوەشـــی شـــیرین دەلـــوێ
نیوەگیـــانێکم هـــەتا لـــەم کـــەژە پـــێ مـــاوە وەرە

بانگی شـــالوورە بـــە حـــەیرانی دەکـــرد گـــازی گوڵـــێک
بـــێکفـــن دەمـــری ئـــەما ســـۆزی بـــە تـــاراوە وەرە

هـــەوری یـــادت دەمـــی ئێـــوارە وەســـەر دڵ دەکـــشا
خـــوێن ئەپاڵـــێوێ شـــەفەق چـــاوی بـــە رێگـــاوە وەرە

بـــە کـــەزێت بیـــسرە ئەســـرینی شـــەوی بـــێتـــۆییم
ئاشـــــکرا پێـــــت نـــــەکرا رۆژێ بـــــە شـــــاراوە وەرە

دابی ئـــــەم هـــــەردە لـــــە زووڕاوە ئەوینـــــدار کوژییـــــە
کـــــەرەمت بـــــێ دژی یاســـــــایەکی وا بـــــاوە وەرە

دوور بە لەو گۆڕەگۆڕەی لێوە نەیـە، دەی گوڵـە گیـان
پیاڵـــەکەت پـــڕ کـــە قـــژی لـــێ بـــدە دەم بـــاوە وەرە

ســـێبەری تۆیـــە لـــە ســـەر پـــەردەیی رێ ئـــاگری کـــۆڕ
ســـازی دەروێـــشە دەفـــەی دڵ دە بـــە هانـــاوە وەرە

شەرحی ئایەی رووە ئەگریجە لـــە نـــاو پـــۆلی خـــەیاڵ
دەوری خـــاڵ و خـــەتی «بـــۆران» بـــە موتـــاڵاوە وەرە

٢٦ی خەزەڵوەری ١٣٧٥

## ئاواتی محاڵ

هێنـــده بـــه تاســـه تـــەزانی دڵـــم چـــاوه کاڵـــەکەت
باڵـــی بـــزەم کەســـیره بـــوو لـــه بـــاخی خەیاڵـــەکەت

وەی بولبولی حەیران ســروه بــه ســرته تێمــیگەیانــد
گــوێی گــوڵ گرانــه چ کەڵــکی نــەبوو ئــاه و ناڵــەکەت

تــاڵاوی زەمــان بــه زاری ژیــن کــەنگێ شــیرین ئــەبوو
بــێگەســـتنی ســـێوی چناگــه نەختاڵـــێ چاڵـــەکەت

عەڕشی کەوو بــه ســوژدەی ئــەوین کــەوی ببــێ هــەتا
کـــوا جیلوەیـــەکی عاسمـــانی پـــیرۆزه خاڵـــەکەت

چاوی دڵــم چەشــنی شــەفەق چەنــد خــوێنی تــێچــزا
تـــاریکی قـــژ کـــه داگـــیری دەکـــرد کوڵـــمه ئاڵـــەکەت

تـــەزبێحی فرمێـــسکی ئەمـــشەوم وا کـــوتوپچـــڕ ببـــوو
ســـوکنایی لام کـــۆچی کـــرد و نـــەگیراوه فاڵـــەکەت

شانەی گوڵ وشه وا به شـیرینی ریـز ئەکـەی خـەیاڵ
هـــەر تـــازه ئەڵـــێی مژیوتـــه لـــه لێـــوی هەڵاڵـــەکەت

بولبـــول وەره جـــا مـــەمره بـــه ئێرەیـــی بـــەیانی زوو
بۆ شنەی شەماڵ بـــه عیـــشوه دەشـــنایەوه گوڵاڵـــەکەت

نــەک مــن هــەموو عالــەمت تێگەیــشت چ بــێوەفــای
بــۆ شــایەدی بەســە پەســلان[1] بەلــێنە بەتالــەکەت

ئــەی دڵ لــەو شــەوی زولفــەدا چلــۆن ڕۆژ ئەکەیتــەوە
ئــــەوڕۆ پەرێــــشانی ئــــەهێنا زریــــان هەواڵــــەکەت

بــا شەقــڵی خەرمانەکــەی ڕووی نەشــکێنێ ئــارەزوو
جــاری لــە دوورەوە لــە دەوری ببزێــوە باڵــەکەت

هیوابــڕاو مەبــە بــۆران بــە لێلایــی ناحــەزان
دەســــتەملانی بەیانــــە ئاواتــــە محاڵــــەکەت

ساروقامیش ـ ١٢ی خەزەڵوەری ١٣٧٥

[1] – قیامەت.

## سامی سووتان

تــا بـــزەی لێـــوی گولّـــت فێـــری گرانجـــانی نـــەبوو
بولبـــولی پـــەتیارە ناوبـــانگی غـــەزەلزانی نـــەبوو

خۆشترین دەرسێ کــە فێــر بــووم لــە زانکــۆی عیــشقی تــۆ
دیلــی دڵ بــوو بــۆ کەســێ ترســی ســەر و گیــانی نــەبوو

ســەد کــڵی نمــروود ســەهۆڵبەندانــە بــۆ گیــانی خــەلیل
دڵـــنیا دێ وا پەپوولـــە ســـامی ســـووتانی نـــەبوو

کێ سەری بــەرزە لــە ئاســتی ئــەو کەســەی خۆشــی دەوێ؟
چەشـــنی ئیـــسماعیل ئەگـــەربۆ کابـــە قوربـــانی نـــەبوو

ڕۆح بـــە پێـــشوازی کـــزەی مـــەیلت دەنێـــرێ ئـــەم دڵـــە
کـــاول وێرانەیـــە ئـــەو ماڵـــە میـــوانی نـــەبوو

تـــوورە باســـکت هەڵـــتەکان و ڕۆیـــی و دڵـــمت شـــکان
شـــایەدن فرمێـــسکەکان شـــەرتی دڵـــۆوانی[1] نـــەبوو

بـــانگی زۆر لێکـــراوی عەڕشـــی خـــوا دەلەرزێنێتـــەوە
ئـــای شـــوکر! پەنجـــەم وزەی ئـــازاری ئینـــسانی نـــەبوو

---

[1] – میهرەبانی

قــاو بــڵاوە باســی بەدمەســتی لــە ســەر زاری گــەڕەک
وشــکە ســۆفی وا لـــە گــەڵ پەیمانــە نێــوانی نــەبوو

جـا لــە تــەکیێوە ئەگــەر ڕێم کەوتــە مــەیخانان چ بــوو؟
بەرهــەمی وریــایی خــۆ هــەر وەرهــەمی هــانی نــەبوو؟!

تاعـــەتی دوو چـــاوی مەیگێـــڕ تاقـــە ســـەوداییێکە وا
حەســـرەتی بـــوو بـــۆ دڵ و خێـــرا پــەژیوانی نــەبوو

لێــو بــەبارم گــەر ببینــێ دێ دەڵــێ ئاشــت بینــەوە
ماڵــی خــەم ئــاوا بــێ یــار ئەوڕۆکــە تــۆرانی نــەبوو

لاوکــی مەســتی بەســۆزە بەســیە بــا دەنــگ هەڵــبڕین
گوێی گــوڵان نابیــسێ ئــەو نەغمــەی کــە حــەیرانی نــەبوو

هەست بەسەربەستی نەکەی هەر دەس بەسەربوونە بەهەشت
بــاوە ئــادەم ســەردەمێک ئــەی تووشــی وەیــلانی نــەبوو؟

خــۆ لــە مێــژە کرمــەڕێزی ســـەبرە ئــەیووبی دڵــم
دەردی ئــێم ســاقیا ئــەی بــۆچی دەرمــانی نــەبوو؟

مــاچی ئــەو لێــوە وەباڵــیش بــێ وە ئەســتۆ ناکــەوێ
خۆم بــە جێــی دڵ ســوێند ئــەخۆم بێچــارە تــاوانی نــەبوو

شێعری چاوی تۆ بــە چــاپی کــل لــە هــەر کــەس دەرکــەوێ
هێدییــە گــەرچی وەک ئــەو بۆرانــە دیــوانی نــەبوو!

١٣٧٥/٢/٢٧

# خۆزگە

پێشکەش بە قەڵەمی مامۆستا فەتاح ئەمیری

خۆزگە بـەو کاتـەی پـەژارەش بـۆ دڵـم شـادانە بـوو
مانگی چاردەی رووت نیگامی لێ وەکوو خەرمانـە بـوو

تاریک و روونی کەزێ و لاجانـگ خەیاڵـی هـان ئـەدا
شەقڵی گۆناکـەت شـکاوی گـرووی دڵـی دێوانـە بـوو

لەو بەهەشتی کوڵمەدا ئەگریجە سەربەسـتی دەویـست
گرژ و لوولی جاربەجاری گشت لـە داخـی شـانە بـوو

بیر بـە دڵـگەرمی ئـەوینت شـەو لـە رێبەنـدانی ژیـن
تاقـەڕێزانی رچـەی نەشـکاوی ئـەو کوێـستانە بـوو

چەنـد لـە نێـو ئەنگوسـتەچاوی بـسکەکانتدا پـشووم
پـێدزە رەوتی لــە خــۆفی پرپــرە و لەرزانــە بــوو

تـۆی لـە سـەرچۆپی نەدیبایـە نـەمامی بـەر شـنەش
کەنگێ شۆخی شـارەزای ئـەو دەسـرە لـێبادانـە بـوو

هەستی دڵبەندیت لەگەڵ من هێنـد لـە رادەی تێپەڕانـد
ئێرەیـی وەک یـەک نەسـیبی ئاشـنا و بێگانـە بـوو

نووسەری چاوت لە بەر گریان دەسـی نـەچووە قەڵـەم
دەس بەسەربوونی ئەوین چیرۆکی ئـەم دەورانـە بـوو

رێژنەی فرمێـسکی شـێعرە تـەڕ دەکـا هـەردی تەمـەن
هەوری ناکامی، برووسـکەی رۆحـی ئـەو بارانـە بـوو

جـەرگی خوێنـاوی سـیامەندی شەڵاڵـی سـەر چـڵە
تا فەلەک هەبووە حـەزی لـەو بابەتـە ئەفسانە بـوو

باڵی سەوزەی وا کەلەبچـە کـردووە شـەختەی خـەزان
چۆمی گۆرانی مە جەڵـغەی ئـەم شـەوی بۆرانـە بـوو

١٣٧٦/٢/٤

# بەڵگە

ماڵـــی پـــڕ هـــاوارە ژیـــنم تـــا دڵ و دیـــدەم هەیـــە
شەرحی وانەی خـەم بـە فرمێـسکان هـەتا بیـدەم هەیـە

دەستی کورتی دێنێ شـێعر ئـەوڕۆ بـە پۆیلانـەی بـزەت
گیان بە شاباشـی لـە سـەر لێـوە بـڵێ چـی کـەم هەیـە

بانگی غەیبـە دای بـە گـوێی هەسـتی مـەدا ڕۆژی بـەرێ
هەر لە بەژنی ژیـنی تـۆدێ ڕەنگـی هـەرچی خـەم هەیـە

پـێپـەتی هـاتم بـە قوربـانی ئـەوینم وەرگـری
چاو لەخوێن بارگەی دەبەست زانیبووی ئەو قەستەم هەیە

خـۆم لـە سـایەی ئـاوری ئێـوارە تـا لـێ ون دەبـێ
ئێستە دڵ ئاگـای لـە بـەینی پەڕپـەڕۆک[1] و شـەم هەیـە

خۆت بـە هـیچ دڵـدارێ لـەم دونیایـە نەنوانـد و کـەچی
پـڕ جیهانـێ بـۆ جـوانی تـۆ ئـەمن بەڵـگەم هەیـە

خاڵـەکەت بـەرچاوی ئەقـڵی دیـنی وا لـێ گرتـووم
بـۆ جـودایی خانـەقا و مەیخانـە لێـک ئەسـتەم هەیـە

1 – پەپوولە

وێنەیــەکی بێتــە ســەر ئاوێنــە بــێ‌ئــۆقرەی دەکــا
خاڵی ســەر پــشکۆی کوڵــم گــڕ دەوری دا هــەر دەم هەیــە

بــا نەڵــێن بــێ‌بەرهــەمی بــوو ژیــنی دڵــداری هــەتا
بــەش ئەوینــدارێکی بــێ دڵ پــڕ زەوی وەرهــەم هەیــە

شەو دەفەی مانگم شەهید بــینی بــە دەس دەروێــشی کــەژ
تــا بــەیان بــەردان لەگــەڵ ئەســتێرەدا جەزبــەم هەیــە

شێعری من یاسای ئەوینی تۆی رەچــاو کــرد هــەر دەڵــێی
بەینی مەنزوومــەی هــەتاو جێگایــێ بــۆ بەســتەم هەیــە

رازی دیلی خاڵ بە تــای ئەگریجــە بــۆ کــەس هەڵــنەهات
قــاتی زانایێکــە بــۆران ئــەو گــرێ‌پووچکــەم هەیــە

١٣٧٦/٥/٢٠

## سرتە

شـــەو بـــە ســـرتە پێـــت وتم ســـۆزی بـــەیانبـــەردان ئـــەڕۆی
دەست لە ناو دەســـتی چـــەمی ئەســـرینی ســـەرگەردان ئـــەڕۆی

وشکەساڵـــــی کـــاریێ وای کـــرد نرخـــی ڕۆحـــــە پێکـــــەنین
گەوهـــــەری فرمێـــــسکەکانم بۆیـــــە وا هـــــەرزان ئـــــەڕۆی

ئـــــەی سیاساڵـــــی ئەوینـــــداریت لـــــە بـــــیر بردینـــــەوە
جەرگی گـــوڵ ڕەش بـــوو هـــەور کۆچبـــاری بـــێبـــاران ئـــەڕۆی

پیـــان وتم دوێشـــەو لـــە خـــەودا ڕوومـــەتی مـــاچ کـــردووم
بـــۆ ســـەفەر ســـۆمایی دوو چـــاوم لەگـــەڵ گریـــان ئـــەڕۆی

تـــا بڵێـــسەی ئـــاوری کـــۆچ هەڵـــدەقرچێنێ هـــــەناو
ســـامی دڵ دەشـــکێ لـــە دۆزەخ، قافـــڵەی یـــاران ئـــەڕۆی

دەس بەســـەر بـــوو ئـــارەزوو فێـــڵیان لـــە ئاوەزمـــان دەکـــرد
وا بـــە تاڵـــووکە بـــە جـــێ دێـــڵی مـــەکۆی جـــەردان ئـــەڕۆی

هەست بە سەربەستی نەکەی هەر دەس بەسەر بوونە بەهەشت
چارەنووســـی هـــۆزی ئـــادەم وایـــە تـــۆش وەیـــلان ئـــەڕۆی

وەرزی دروێنـــەی نـــەهاتی کـــول دەبـــێ داســـی زەمـــان
لێـــرە تـــا زریـــان ئـــەچنێنن شـــین ئـــەکا بـــۆران ئـــەڕۆی

١٣٧٦/٦/١٦

## موکوریانی

بۆ بداخ سوڵتانی برام

گیانەکەم! دووری دڕووجاری موغیلانە مەڕۆ
دڵ بە دووی خاڵەوە ناسۆری هەتا مانە مەڕۆ

بە تەما بووم کە بەهار بۆ کەژی ژین بخوازیت
لە چڕۆی شادی چلووره مەکە پۆیلانە مەڕۆ

رانک و چۆغەی گڕی ئەوڕۆکە لە بەردایە شێعر
گوڵی واژەم مەخە بۆتەی خەمی جانانە مەڕۆ

بەرد لە جێی خۆی کە دەبزوێنی قورس نامێنێ
جا دڵت هەڵمەکەنە زیزی لە هێلانە مەڕۆ

گەرچی خاپووره وڵاتی دڵ و بێماڵە ئەوین
چۆڵپەرەستی ئەگە تۆم لا بی چ ئاسانە مەڕۆ

بواری کۆچبارە کە نادا جەغەتووی فرمێسکم
دەس بە داوێنی نزا بیری هەراسانە مەڕۆ

کۆچی لێ ناوە لە گوێی چەم بە خەزان خێمەیی گوڵ
خورپە سەربەندی دڵی بولبولی حەیرانە مەڕۆ

هەر لە دەسکورتی دڵە تەنگەکەمان مەڕوانە
دوڕی فرمێسکی مە دێنێ ئەوی سامانە مەڕۆ

وەک برایم جڵەوت ئەگرێ بە بۆرانەوە خەم
پەریخانت غەزەلی شێوە موکوریانە[1] مەڕۆ

بۆکان ـ ١٣٧٦/٨/١

---

[1] – مەبەست سەبکی موکوریانییە کە لە *وەفایی* و *ئەدەب*ەوە دەست پێدەکا و لە *هێمن*دا گەیشتۆتە تەشق و تایبەتمەندییەکانی سەبکی عێراقی لە فارسیدا هەیە.

## رەخنە

رۆژی شین و شایی دەڕژێ سەیرە پێم ئەسرینی من
بێکەڵک بوو چاو هەتا رەخنەی دەگرت لە گرینی من

رۆح لە نیزیکی دەگێڕا شیوەنی لێکدابڕان
بەینی خۆت و خۆم عەزیزم جەستە بوو پەرژینی من

ژانی بێعیشقی گڕی بەردامە گوڵجاڕی ژیان
باڵی با بردی پەپوولەی ئارەزووی نەخشینی من

کوڵمەکانت دوا حەدیسی خوێنە شایستە ئەوین
بۆ پەیامی ئاڵی خوێن گرتی فەلەق رۆژینی من

نەزری ئیبراهیمی رێی بەیتەلحەرامێکە شێعر
کابەی ئاواتم دەڕووخێ بێبزەت شەرمینی من

خەونی ئەگریجەت شەوێ رۆحی بە میوانی دەبرد
دڵ دەس و پێی لێ بزرکابوو لە سای شەمزینی من

قەوسی ئەبرۆتم بە نوێژی هەینی کەوتبووە خەیاڵ
هات لە شەققەی باڵ بدا میحراب لە بێحەجمینی من

ئاشکرا گەرچی بە خوێنی ئێمە تینوو بوو دەمت
چاوەکەت شاراوە رەشپۆشی دڵی بە برینی من

دێ کورژنی هەوری ناکامی لە سەر هەردی تەمەن
بەر برووسکەی شێعر ئەدا هەستی جەخارئاژینی[١] من

دڵ کەوی بۆرانی بێهێلانە بوو لەو بسکەدا
چارەنووسی تیغە یا تاکوو هەبێ قەسرینی[٢] من

---

1 – جاری، ئاو تێئاژین کردن

2 – قەسران، مەحتەلی زۆر (هەر نەهاتی ماڵتە قەسرام.... قەسریم)

## شەوێن

شـــوانی شـــەماڵ رانی هـــەور لـــە بـــستۆ شـــەوێن ئـــەکا
ســـروە بـــە ئەگریجـــە رووەمـــەتی گـــوڵ باوەشـــێن ئـــەکا

دەرویـــــــشەکەی زەوی بـــــــە دەفـــــــەوە کۆلکەزێڕینـــــــە
رۆحـــــی هـــــەتاو بـــــە جەزبـــــەوە بـــــێ‌سەروشـــــوێن ئـــــەکا

دەســـتی برووســـکە لـــە خەزێنـــەی تـــەژی خونـــاوەدا
شـــێعری چیـــا لـــە پـــەڕی هـــەردا گەوهـــەر پـــژێن ئـــەکا

سەرخۆشـــی بـــۆنی کـــەزێی گەزیزەیـــە هەســـتی شـــەماڵ
لێـــوی گـــۆڕەی تـــەڕی ئـــارەقی ســـۆفی‌بـــەزێن ئـــەکا

بولبول کە لە سەر شەقامی شنە رێـی بـە خونچـە گـرت
ترســـــی جنێـــــوی دڕووی نییـــــە داوای بەڵـــــێن ئـــــەکا

فـــەرهادکوژی چلـــە داخـــی دڵـــی بـــە کـــێ نەڕشـــت؟
جـــەرگی رەشـــی چیـــا چـــاوی چۆمـــاو خـــوڕێن ئـــەکا

تـــاپۆی شـــەهیدە گوڵاڵـــە لـــە ســـەر زەویـــنی نیـــشتمان
ئـــاهی تـــەمێکی هـــەتاییـــە کێـــو مـــل بـــەکوێن ئـــەکا

شێعری تەڕی بـۆران بـا نـەژی ئێـستا بـە پووشـویەک
ئـەو رۆژە دێ کـە هـەر تاکەیـەکی نرخـی خـوێن ئـەکا

بۆکان ـ ١٣٧٦/١٢/٩

## عیشقێکی چیایی دەمرێ...

شینی گوڵەباخەکانی سروە

شـــەو خـــەو ئەشـــکێتە چـــەمی هەســـت و بـــەرایی دەمـــرێ
مانـــگ لـــە ســـەرخۆ چـــووە، تیـــشکێکی خـــوایی دەمـــرێ

گەنجی فرمێـــسکی لـــە دوو رۆچـــوو بـــە هـــەردی کەســـەرا
لـــــەم هەژارخانەیـــــە، «ئاغـــــایی» هـــــەتایی دەمـــــرێ

کێڵەشین خـــۆی لـــە خـــم ئـــەگرێت و شـــنۆ جـــەرگی هـــەژا
هەرەســـــی لووتکەیـــــە عیـــــشقێکی چیـــــایی دەمـــــرێ

گـــــۆلی ورمێیـــــە کەحێلانـــــە ئـــــەحیلێنێ لـــــە ســـــۆت
شـــــەرە نـــــاخێوی بـــــڕا ســـــواری لـــــە شـــــایی دەمـــــرێ

ســـنگی ئەســـتێرە مـــەکۆی خورپەیـــە لـــە کراســـی شـــەوا
هەڵـــــدەچۆقا بـــــە کـــــزەی ژانی جیـــــایی دەمـــــرێ

خۆشەویـــستانی ئـــەوین گـــشتی بـــە جێیـــان هێـــشتین
دڵ! ســـــەبووریت لەســـــتۆ نایـــــە برایـــــی دەمـــــرێ

نیـــشتمان! رۆیـــی بـــزەت بـــۆ بـــە قـــەرز وەربگـــرێ
تـــاکوو چـــاوت بـــسڕی خـــوێی لـــە بـــایی دەمـــرێ

سـوروە داوێـنی لـە دەسـتی حەپەسـاویدا بـوو
چەپکـە بۆنـێ رەوەکـی موشـکی خـەتایی دەمـرێ

بـۆ چەمـەرچۆپی جەلـەی بەسـتەوە دونـدی کـەژەکان
کاکەشـان بـوومی عـەزای «قـازی»یـە دوایـی دەمـرێ

وشـەکانی خـەتی خـوێنین لـە ئـەوینێک ئـەدوان
ویـستی «مەنـسوور»ە لەگـەڵ دڵ بـە تـەبایی دەمـرێ

شـیوەنێک بـاڵ و پـەڕی هـێمنی هەڵـدەپڕووزاند
شـەوی بۆرانـە چـرای بـیرە سـپایی دەمـرێ

١٣٧٦/١٢/٣

## نادرێ

زمانی ئەسرینم شکا شەرحی خەمی پێ نادرێ
باوەڕی هەستم پەشۆکاوە نەمی پێ نادرێ

ئاگری کۆچت بڵێسەی دێ لە سەر لووتکەی دڵم
کام چیا بەرزی نەدیوە خوا تەمی پێ نادرێ

هەوری هەرچی سۆزە شێعرێکم بە فرمێسکی بکات
تازە دڵخۆشی دەروونی خەستەمی پێ نادرێ

خورپە گرتوویە دڵی ئەستێرە لە کراسی شەوا
مانگ شەریکی خەمتە نرخێکی کەمی پێ نادرێ

جەرگی باوکم دی لە ڕێی فرمێسکەوە بارگەی دەبەست
چون سەبووری کۆستی گەورەی کاکەمی پێ نادرێ

ئەقڵ ئەگەرچی پێی وتم هەر هاتنێ چوونی هەیە
ئەو دڵە بڕوایی کۆستی ئەستەمی پێ نادرێ

کۆست بە شوێن کۆستا دەهات دیسان لە هۆزی پەڕپەڕۆک
گوڵبژێرن کوردەواری ماتەمی پێ نادرێ

«ڕۆح لە نیزیکی دەگێڕای شیوەنی لێکدابڕان»
کۆچی خۆمم دیت و خۆڵی جەستەمی پێ نادرێ

تووڕەیە بۆران کە نازانێ لەبەر چی هات و چوو
لووتکە رامانی جگە بەفرە خەمی پێ نادرێ

١٣٧٦/١٠/٢٣

## بەیان بەردان

کۆچی سووری ئارەزوو سوار ئەسپە شێی گریانە بوو
ڕۆندکم بۆ زەیڕەوشانی بەژنەکەی هەرزانە بوو

بیر بەرەو مانگی مونیری روو شەوارە کەوتە ڕێ
بسکەکەت کێشایە تاریکی و خەدەی کوردانە بوو

ڕوومەتە ساکارەکەت فەرهەنگی خاڵە بۆ خەیاڵ
تا موتالای جوانپەرەستیم کردووە تاقانە بوو

سوێندی گەرومم خواردبوو ئاوڕ لە ڕەشخاڵی نەدمم
دەستەلاتم کوا لەسەر بیلبیلەکەی دڵتانە بوو

چاو لەسەر بەرماڵی فرمێسک دەبا سوژدەی ئەوین
سۆفی مێحرابی برۆکەت ئیشی ئەو فەڕزانە بوو

جایزەی نوبێل بە شێعری شاعیرانی تر بدەن
من خەلاتی بێنیازی عیشقی تۆم شێعرانە بوو

هەرکەسێ بە شتێکەوە شایی بە خۆی هات، من بە خەم
شا! تەمومژ هەر خەلاتی ئەو چیا بەرزانە بوو!

چاوەکانی تۆ نە بیرەی عەڕشە لەو بۆکانەدا
هەر لە ژوور سەرمە لە کوێوە ئاسمان پەیدا نەبو؟!

موعجیزەی ئەنگوستی پێغەمبەر پیشانی خەڵک ئەدا
تایە بسک وا لەسەر ئەو مانگی هەنیە جوانە بوو!

شەو گزنگی پەنجەکەت مەقنەی لەسەر سینگ لادەبرد
چەندە بۆران چاو لە ڕێگەی ئەو بەیان بەردانە بوو

نالەشکێنە ١٣٧٧/٢/٢٢

# برۆم

لێمگەڕێن بەم شەوە لەم شارە بە شاراوە بڕۆم
سەری خۆم هەڵگرم و لەم کوونە ئاژاوە بڕۆم

ئێمە هەر شاربەدەری خێڵی دهۆ بووین وەتی هەین
چارەنووسی منە با لێ‌دەم و لەم ناوە بڕۆم

بەردەبارانی رکە[1] ئاوێنەکان ئەشکێنێ
دڵ گزەی دیوە، لە خۆڕاوە نە ئێشاوە بڕۆم

عاسمان لێرە بە رۆژ خۆی لە خم ئەگرێت و شەویش
مانگ بە رەشپۆشی دەبینم لە ئەوی لاوە بڕۆم

تاکوو دوێنێ بوو دەپاڕامەوە لێت گیانە مەڕۆ
سۆزی دڵتەنگی لەبەر عیشقم ئەپاڕاوە بڕۆم

سەردەمێک تووشی پشیلەش کە دەبووم رێزم ئەگرت
سەر و رووی جامی ژیانم هەموو رووشاوە بڕۆم

بڕێ زانین وەکوو هەنگوینە لەناو پێستی سەگا
دەستی هەستی بە فریوێکیەوە گلاوە بڕۆم

[1] – رەقابەت

**فاسـقی خەمـسەیە بەرماڵــی لەسـەر ئـاو ئەگـەڕێ**
**ئــاوری ســووچی لــەمێژی مەیــە نــەکوژاوە بــڕۆم**

**ئــەوی هەســتت بیــەوێ ئــاوەزت ئــەیبوغزێنێ**
**تــازە لــەو هــەردە زمــان مــەیلی دڵــی نــاوە بــڕۆم**

**ئاسمــان دوور و زەوی ســەختە خــوا هانایــەک**
**تــەنگی ڕێگــا ئــەتۆ بیکێــشە منــیش واوە بــڕۆم**

**ئاسـۆ جـاڕز بـووە هێنـد شـایەدی بـۆ کـازێوە دا**
**شەونمیش ئـارەقی شـەرمێکە لـە ڕووی گیـاوە بـڕۆم**

**گـڕی بـێڕێـزی پـشووی وشـتری نـا دۆژەهـەوە**
**وا مهــار لێــرە بــە کورتانــەوە بەســراوە بــڕۆم**

**پێـرێ پیلانـێ لـە نـاو بـاخی بەهەشـت ڕاوی دەنـام**
**وێڵی سەربەستی لـە هـیچ شـوێنێ نەگرسـاوە بـڕۆم**

**پیــاوەتی شــرت و گــومی هێرشــی بۆرانــە ورەی**
**ڕۆژی ڕوونــاک مــن ئەبینیتــەوە بــە چــراوە! بـڕۆم**

بناو ـ ١٣٧٧/٦/٤

## دیمانە[1]

عەڕشــی شــین ئەمڕۆکــە چاویــت دیتــوە مەیــشارەوە
نامــە! پێتــە شــۆقی دیمانــەی لــە پیرانــشارەوە

کــەسنەزانــە چەنــدی پرســیومە نیــشانەیماڵــەکەی
مانــدووە ڕۆحــم بــەڕێی نــامۆیی بــێ باشــارەوە[2]

چاوەکانی تۆ بــە دوو پــشت دەچنــەوە ســەر عاســمــان
شــێعرێ پێمــی وت بــە ئیلــهامی کــزەی ئــاوارەوە

دڵ کە دەروێــشانە ســەرچۆپی لەســەر ئــاگر ئــەگرت
ئای دەفەی خــۆرم شــەهید بــینی بــە دەس ئێــوارەوە!

ڕەوتی سەروی بەژنەکەت بۆ شێعری مــن نابــێ کــەوی
چــومی فرمێــسکم شــەپۆلی بــۆ ئــەنارد لــە بــوارەوە

دەردی عیشقم بــردە هــەر کــۆڕێ خەڵــک پــێمپێکــەنی
تــەنزە چیرۆکــی ژیــانم بــەو هــەموو ئــازارەوە

خانــەخوێی مــانگی مــونیرم ئێــستە خــاکی خانەیــە
بــا بەســەر خۆیــا بکــا بۆرانــە شــێت لــە بنــارەوە

بۆکان ـ ١٣٧٧/٦/٢

---

1 – چاوپێکەوتن، ملآحبە [دیمانەت بەخێر!]

2 – چاو/ باشاری نایە: چاری نایە.

# لێژ

ڕووت چرادێــری شــەوە دونــدی ئــەوین لێــژی مەیــە
ڕازی کەزیــەت لەســەر ئــەو ســاوە پــەلاوێژی مەیــە

دەس لە ئەستۆی شەوی مەش کەی چ دەبێ مانگی مونیر؟!
کاکەشــان چــاوی پڕئەســرینی گــەلاوێژی مەیــە

لای خــەزان زەردەی ئــەتۆی ســەوزە بەهارســتانە
خاکــەلێوەش دەمــی بــێتــۆیی گــەلاڕێژی مەیــە

ئاسمــانی جەغــەتووی شــیوەنی شــێعرە چــاوت
تەمــەنێک شــایەدی بارانــە نــزای نــوێژی مەیــە

لــێگــەڕێ بــا تــەرە بــێ ئــەو دڵــە وەک باوئــادەم
خاڵــی تــۆی بــینی وتی مــەحرەمی ڕاوێــژی مەیــە

ڕۆژێ هــەر دێ کــە لــە خۆڵــم وەرئــەدا غــاری زەوی
خــەمی پــێ نــاوێ گریمــان ســەرێ گــوێرێژی مەیــە

کودتــای تیــا نییــە پێتــەختی هەژارەخانەکــەمان
تــا فەلــەک ڕۆژێ لــە خــۆی دەرئــەچێ لاپێــژی مەیــە[1]

ســۆزی بــۆران و ســڕی هــەنگ بــە وتــن هەڵــنایە
ســەری ســووڕماوی ســتێران لــە حــەوا گێــژی مەیــە

١٣٧٧/٧/٧

---

[1] – سەعدی فەرموویەتی: ابر و باد و مه و خورشید و فلک در کارند.

## شەقڵ

شەقڵی گۆنای مـانگی دەشـکان مـاچی گـەرمی نیوەشـەو
ئـاورپێکم دی لـە رووی کاڵـێ لـە مانـگ نەیـدیوە شـەو

ئـاگری هـاواری مەگـەر نـەچووە جەسـتەی کاکەشـان
تـا بـەیان بـۆ وا لـەگـەڵ ئەسـتێرەدا لـەرزیوە شـەو؟!

عاسمان ساقی بـوو، ئاسـۆ جـامی مـانگی هەڵدەداشـت
کراسـی ئاودامـانی کردبـووەوە بـەری لـە زریـوە شـەو

خـوو بـە دیلـی بگـرێ هـەرچی، راچـەنینی ئەسـتەمە
بـۆ پـەیامێ رۆحـی بـوو ئەسـتێرەکان گەچـڵیوە شـەو

بـا بـە لای چەپکەگـەزیزەی بـسکەکەتدا تێپـەڕی
ئەی لە کوێی بوو ئەو هەموو بۆنەی لە تۆ نەدزیوە شەو؟!

تـا ئەوینـداری و هـەژاری رۆژی روونم رەش دەکـا
کاکەشـانی کۆشـی یـادێکی خەزێنـەی زیوەشـەو

چـی گـەلی ئـاوازی خنکـاوە لـە زەریـای سـامی رۆژ
مەستی ئازادی ئەوا کۆنـسێرت ئـەدەن بـە قریـوە شـەو

بانگی رۆمی بیست لەسەرخۆ چوو بـەیان مـانگی مـونیر
کەزیەکەت ئەسرینی بـۆرانی لـە چـی نەسـڕیوە شـەو؟!

١٣٧٧/٨/٢٨

## مونیره

هەر لەســەر چــۆپی ئــەوین لــێمبــوو بــه شــیوەن داوەتم
خــڵتەخۆری جــامی کــسپەی ئـــەو بەڵــێنە شــکاوەتم

قەت نــەبوو لـــەو ساوە تــۆم ناسـیوە دڵ ئاسـوودە بــێ
خۆ بە قــەهر و مێهــری تــۆ گیانــه هــەر ئــەم تاسـاوەتم

تۆ بــەهاری و ئەرخــەوان ســوورە چــەمی فرمێــسکی مــن
تا بــە گــۆلی خــۆی دەگــەم پووشــی بــەر ئــەو لافـاوەتم

بسکی خاو سەبری لەسەر هەنیەت رژا سەر عەرشــی چــاو
ئەی مونیرە مەحوی ئەو رووی مــانگی هــەورە و ســاوەتم

ســێبەری ئـــاواتی کوشـــتم داری شــێعری بەژنەکـــەت
دڵ شـــەهیدی سەرچـــڵی ئـــەو ئـــاخرین هـــەنگاوەتم

هــەر کەسـێکم خــۆش بــوێ خێــرا بــەجێمدێــڵێ دەڵــێی
سووچی تۆ نەبووە کەوا بێبــەش لــە رووی ئــەو تــاوەتم

رۆژی روون خانــەنــشینی کەزیــە خــۆم لــێ ون بــووە
تــای ژیــان ئاڵــۆزی دەس ئــەو بــسکە پــرش و بــڵاوەتم

هەستی بۆران تا لــە دووی ونبــووی لــە زەریــای داوە دڵ
رۆح بـــە کـــۆڵ ئاخێکـــەوە راپێچـــی شـــەوگێژاوەتم

خەزەڵوەری ١٣٧٧

## یادی بە خێر!

خــەونی لاویم بــەو شــەوی بــسکەی ســپارد یــادی بــەخێر
ئاهی خەرمانــەم بــەرەو رووی مــانگی نــارد یــادی بــەخێر

ئاسمــــانی چــاوی تـــۆ تەقـــڵەی بـــە ژیـــنم لـــێ ئـــەدا
دانەدانــــــەی خاڵەکانیـــــشم بـــــژارد یـــــادی بـــــەخێر

دەس لە مل کەڵوێ[1] سـنووری جـێدەهێـشت ئەسـرینی مـن
لەو هــەموو خوڵــک و بەڵــێنە خــۆت بــوارد یــادی بــەخێر

دێتــە بــیرت پــێم وتی لــە دوای خــوا تــۆم خــۆشدەوێ؟
نامەکانیــشم بــە رووت ســوێندی ئــەخوارد یــادی بــەخێر

تـــا نـــەچرپێ رازی دیمانـــەت بـــە گـــوێی نامـــەحرەما
هەر لە دوو تــوێی خانــەی ئیهـامم دەشـارد یـادی بـەخێر

باخـــەوان لاقـــی مـــەلی دەشـــکان و گـــوڵخونچـــەش دڵـــی
ئــەو خەســارانەی دەســی کــەس نــەیبژارد یــادی بــەخێر

جــەزر و مــەددی شــیوەنم تۆفــانی رووی مــانگی مــونیر
رێی مەترسی بوو شــەویش تاریــک و ســارد یــادی بــەخێر

تـــاری دڵ هێـــشتا چریکـــەی ئـــاگراوی زەخمەکـــەت
بــۆ هــەوای ســازێ تــر ئــەمنت هەڵپەســارد یــادی بــەخێر

رۆژێ بـــــۆرانی ئەوینـــــدارت بـــــە ناڵەشـــــکێنەوە
چاو لــە رێــی گیــانی بــە تــۆزی رێ ســپارد یــادی بــەخێر

لەو هەموو گوڵــچەپکە شــێعرەی ســروە نــاردی بــۆ بــەیان
باســی خونچــەی لێــوی ئاڵــی هەڵــبژارد یــادی بــەخێر

١٣ی خەزەڵوەری ١٣٧٧ ـ بۆکان

---

[1] – چۆمێکی سەر سنوورە.

## کۆچی بێوادە

چلـــــە بیدادییـــــە لـــــەم مەڵـــــبەندە
هەڕەشـــــەی شـــــەختەیە تـــۆف و بەنـــــدە

تـــا خـــــەزان دێتـــــەوە هـــــەر زســـــتانە
خـــــەم بـــــەهاری دزی لـــــەم کوێـــــستانە

تـــــەم بـــــەری گرتـــــووە ســـــۆمایی هـــــەتاو
دەشـــــتە بـــێنـــاز و چیـــا پـــشتی چـــەماو

هێنـــد لـــە مێژەکـــە زەمـــان کـــەوت لـــە زەوی
کوانـــوو بـــێپۆلـــوو وەجـــاغکـــوێرەوەوی

داخ لەســـــەر داخ و تـــــەم ئاوێتـــــەیی خـــــەم
ژان هـــــەتا نـــاخ و نـــــەم ئاوێنـــــەیی چـــــەم

شـــــەوی کۆچـــــەر خـــــەمی لـــێمیوانـــــە
ڕێگەچـــــڕتر لـــــە گـــــەوەی کوێـــــستانە

لـــــەم هەژارخانـــــــەوە ڕۆیـــــــشتەدەرێ
گەشـــــتی پێدەشـــــتی ســـــەری کەوتەســـــەرێ

ئەســـــپی سەرکێـــــشی شـــــنەی بۆزینـــــە
جێـــی لەســـــەر عەرشـــی بـــــەرین دابینـــــە

مانـــگ جلەوکێـــشیە بـــۆ ئەوبـــەری پـــاک
کاکەشـــان رایـــەخی ئـــەم گەوهـــەری تـــاک

«گەشـــن ئەســـتێرە چ بـــەرزن چ نـــەوین»
هـــەموو پێـــت وایـــە ئەویـنـــداری «ئـــەوی»ن

**دێ بەرەو رووی لووزەوی ئەستێرە**
**کۆری هاوڕازی وەکۆوەن لێرە**

**لەم ستێرانە یەکێکیان وایە**
**گرشەکەی چاوی لە بەر هەڵنایە**

**دڵی کەیل و پڕی تاسە و بریا**
**زووڕەزووڕ پێکەنی قاقا گریا**

**گریە بۆ حاڵی ئەوانەی لە زەوین**
**گیان ئەبەخشن بە بزەی لێوی ئەوین**

**«پێکەنین بۆیەکە پەرژینی بەزی**
**پی نەوەستا پەری هەر دێو ئەبەزی»**

**«جاڕەوی مژ لەبەر ئەو پیوارە**
**گەش و روون بوونەوە بەو دیدارە»**

**دەسلەمل بوونە یەکێکە لەشیان**
**لە چ نەدوا تکە ئەشکی گەشیان**

**چەندە بێوادە بوو ئەو کۆچە هەژار**
**ها لە رێدایە شنەی تازە بەهار**

**وەگەڕێنە سەری کۆچ شۆڕەسوار**
**بێنە مزگێنی نزیکە ئەوێ جار**

**ماچی کەم خاکی دەرت بەو قەستە**
**پێتبڵێم مژدە بێ دەی‌سا هەستە**

**١٣٦٩/٢/١٥**

## پاییز

پایزە، دار گەلێ داڕووتاوە
لێرەوار مەشخەڵە کوانێ کاوە

پەتی باهۆزە پشووی کەژ دەچنێ
باخ چەمەر چۆپی دەکا و خۆی ئەڕنێ

پەلەوەر تار بووە لەو سارایە
هەڕەشەی داو ئەتەنێ ئەو بایە

تاکوو دی رەنگی پەژارەی بێستان
جۆگە نەغمەی لە گەروودا وەستان

بڕکە دڵ مردووە سەرما بردوو
شەختە لیداوە بەری بابردوو

دوێشەوێ بولبول ئەڵێی گریاوە
چیمەن ئەسرینی لەسەر جێماوە!

شۆخی چیمەن بە تەمەن منداڵە
بە کچی پیر بووە ژینی تاڵە

توێڵی عاسمان پڕی گنجی هەورە
جەورە ئیشی فەلەک هەر وەک دەورە

قامکی کێوی بەناو چاوەوەیە
خووی بەدی بەو تەمە شێواوەوەیە

خۆر لەناو گۆمی تەماوا نوقمە
زێوەری خەونی چیاکان زوقمە

با ئەگەر ئەگرێ لە قۆرغ سیلەی
دار لە سەرمان دێ تەقەی کاکیلەی

زەوی تالانی خەزانی زەردە
کۆنە هاوکارییە شەختەی جەردە

دیمەنی دەشت و چیا ئالۆزە
چاوی کانی پڕی خۆڵ و تۆزە

باخ بە بۆ چەک چوو بە گژ ئەو بادا
شەڕی جانانە لەگەڵ بێدادا

«چۆمی زێڕینە»[1] بە گازی شەختە
شەڕەنا خێوی کراوە یەختە

ورەیەکی نییە بۆ رمبازی
بەری دا لێژ و قەدی هەورازی

ناو روان[2] چەقیە دەمی کردی لغاو
سروە گرتی جڵەوی قامیشی خاو

چۆم ئەنووزێنێ لەبەر خۆوە دەڵێ
کێیە دەتوانێ لە چنگ پیری هەڵێ؟

«ئەرخەوان سووری» بەهارم لەبەری
گوێ زەوی مۆغەرە پشتی ئەلەری

دیوتە چۆن کێوی «پلە و بەردە» سەری
رێز و تەعزیمی خەواندووم لەبەری؟

چیای «قلیچقایە»[3] کە وەک شێری زەوی
تووڕە راساوەتەوە روو لە جەوی

---

1 – چۆمی «جەغەتوو» لەسەر نەخشە ناوی «زێڕینە»یە.

2 – بەژی ناو چۆم، وشکایی ناو ئاو.

3 – لەوبەر چۆمە گوایە مانای شمشێری بەرد ئەدا.

هێـــزی رامالّـــینی مـــن زەنـــدەقی بـــرد
خـــۆی نـــەگرت رۆیـــی لـــە دوور مەنزلّـــی کـــرد

«شـــایی مـــەردان»ێ کـــە لاوە دەیـــەوێ
ســـەر لـــە نێـــو ســـینگی حـــەوا هەلّبـــسوێ

لـــە گـــوێن پـــیرێ کەنـــەفتی لـــەرزۆک
لرفـــەلرفم لەشـــی دێنـــا شـــەک و شـــۆک

خـــەوی بەســـتێن کـــە دەبـــینی قورســـە
ئێـــستەکەش جـــەرگی شـــەقاری ترســـە

لـــە دەســـم داوە شـــکۆ و بـــێوازم
ســـیخە ســـیخی لم و زیـــخ هـــاوڕازم

چـــۆم لەبـــەر خۆیـــەوە دەردی دلّ ئـــەکا
بـــە گـــژەی بـــاوە بـــەرەی هـــەور ئەتـــەکا

جەغـــەتوو نـــوقمی خـــەوی زســـتانە
کـــڕی هەســـتانییە لـــەم کوێـــستانە

تابـــلّۆی پـــایزی زەردەپـــەڕێ دێ
چەنـــدە هـــارمۆنی پـــەژارەی لـــێ دێ!

سارۆقامیش ـ ١٣٦٨/٨/١٥

پێشکەش بە چریکەی بەرزی بازەکەی ئاسمانی ناڵەشکێنە!

## گریان

تا تۆم ناسیوە ژینم گریانە
شەمزین بە ئەوین ئەم دڵ و گیانە

دەبا تێر بگریم بۆ نامرادیم
گریان ئەی هاوڕێی کاتی ناشادیم

هەر دەنکی فرمێسک کە دەڕژێ لە چاو
فێنکی دەخاتە دڵی هەڵقرچاو

ئەسرین مەرهەمە بۆ دەردی کاریم
گریان ئەشکێنێت ژانی خەمباریم

ئەی گریان گریانە مەیلم
دڵ کەیلم وەتی بێ مەیلە لەیلم

کوڵی سنگەکەم هەوری بارینە
هەتا تێر نەگریم بەرنادا سینە

گەردوون بە گریان دادەڕژێنێ کوڵ
تا هەور نەگری پێناکەنێ گوڵ

بگری بەو خەمەی لەدڵتا جەمە
چیا تا نەگری هەر سەربە تەمە

هەرکەس لەگەڵتا جارێکی بگری
لە بیری ناکەی تا رۆژێ دەمری

زمانی ئەسرین هێندە پاراوە
بێدەنگ درکاندی رازی شاراوە

١٣٦٧/١٠/١٠

## به رۆژ

تۆ بڵێی خۆری نیگای گەرمی چ دڵسووتاوێ
دای گزنگی لەسەر ئەو روومەتی بەفرەی تاوێ
کە رەشانگێ لەوێ پەیدا بوو لە گوێن خاڵێکی رەش
ئێستەکەش چەشنی بە رۆژ دەگرێ نیگای هەر چاوێ

ساروقامیش ـ ٢/١٠/١٣٦٨

نسێی سەرگۆمه برژانگی مونیره
رنووی کوێستانه لاجانگی مونیره
حەدیسی تاریک و روونی ژیانه
تریفەی روومەتی مانگی مونیره

---

هەناسه تا هەبێ تاسه رەوایه
شەوی مەش رۆژی رووناکی لە دوایه
بزەی لێوی گوڵی و فرمێسکەکانم
ئەزانم گشت به دەس تۆیه خوایه

## ئێتر هیچ[1]

ئێمەین و شەوی تار و خەمی یار، ئێتر هیچ
سەبری کەم و بێتاقەتی یەکجار، ئێتر هیچ

بینووسنەوه تاقه لەسەر کێلی مەزارم
بۆبێ بەشی دیداریه هاوار، ئێتر هیچ

---

1 – له فارسییەوه کراوەته کوردی.

## بەڵگەیەک

دڵڕفێنی
تیشکی شەمم
بە شەودا پڕگرینگ نیە.
چوانکە جوانی
بە چارشێوی تاریکایی
داپۆشراوە و
ئەم هی بڕەقیبە
تۆ تەماشا دڵدارەکەم
چەندە جوانە
کە دێتە دەر ئێوارانە
هەتاو عاسمانی بەرینی پڕتەنگ ئەبێت
هەڵپەیەتی هەرچی زووتر
خۆی بەرەو بناری ئەو دیو بگەیەنێت!

١٣٦٧/٤/٢٨

## ئێش و نۆش

دوای کێشەی دوێنێ
پەژیوانم دیت
ئەورۆکەش دیسان چاوە مەستەکەی
ئاشکرا شەوقی ئاشتی پێوە بوو
لاتیلی کەوی و کەیلی هەستەکەی
بەڵام نا ئیدی
متمانە ناکەم بەو شەڕفرۆشە
چون باش دەزانم:
بە ئێشەئێشی دوای هەرچی نۆشە

١٣٧٠/١١/١٧

## کراس زەردێ[1]

پاییزە
ساڵ نیوە بووە
دارستان کیژێ تەرپۆشە
دەڵێی ئەمیش
کراس زەردێی تایەر تۆفیقی بیستووە!

١٣٦٨/٨/١٥

---

[1] – لە مامۆستا تایەر تۆفیق پرسی گۆرانیەکانت چ شوێنێکی لەسەر خەڵک دائەنا؟ لە وەڵامدا گوتی: لە بیرمە کە کراس زەردێی من بڵاو بۆوە، کیژەکانیەکجێ کراسەکانیان کردە زەرد.

## خەمێک لە چوار وەرزدا

بەیانیەکی کەسکی بەهار
گوێم لێبوو کە
مەلێکی دونیا گەڕیدە
ئەیوت بە کانی بەربنار
: «ئەمن گەلێ وڵاتانم پشکنیوە ـ
پتر ساڵیان
چوار وەرزەکەی وەکوو یەکە و
ساڵم چەشنی ساڵی کوردستان کەم دیوە»
زنەی کانی سرتاندی بە گوێی لێواردا و
ئەمیش بیستی ـ
خەمێک دڵی نیشتمانی چوار قاش کردووم
بۆ بەهاری گێڕایەوە بەهار گریا
لە فرمێسکی هەزار هەزار سەریان هەڵدا چەم و زەریا
کە خەمەکەی بە هاوین گوت
دەروونی گەرم داگرسا
گەرمێکی وا ئاگری داغ لێدەترسا
پاییز بیستی دایڕنی روومەتی زەردی
لە تاو ئەو خەمە بوو زستان
سەری سپی کرد، کێو و کەژ، دار و بەردی

٢٢ی رەمەزان، ٢٩ خاکەلێوەی ١٣٦٩

## بێگلەیی

ئاسكۆڵەكە
ناتوانم شێعرت بۆ بڵێم
لەخۆڕا گلەیی مەكە
خۆ لە بیرتە
چەندت لەبەر پاڕامەوە
جزیا بەسە دەسهەڵگرە لە ئازارم
با جەورت لە شێعرا نەبێتە شەختەی لاسارم
كەچی نەبوو بە ڕەندیەوە پێكەنیت و پێت گوتم چەندە
كاڵی!
تۆ شاعیری جەورت ئەدەم
تا بە شێعرت گوێی زەمان بزرنگێتەوە وا بناڵی
مخابن بەڵام نەتزانی!
سەوزە بەستەی دڵی شاعیر، هێند ناسكە
شادیش زۆر بێ دەیڕاكێنێ
جەهەندەمی ڕەشو سووتێنەری جەفا
نەخوازەڵا ئیتر چی بە ڕۆژ ناهێنێ؟!

ساروقامیش ـ ١٣٦٩/٤/١[1]

---

[1] – ئیلهامی ئەم شێعرە هی «فەریدوونی موشیری» شاعیری ناسراوی فارسە.

پێشکەش بە تابلۆی «خانی لەپ زێڕین» کاری هونەرمەند محەمەد ڕۆستەمزادە.

## پەند

**منداڵەکان**
**بێفڕ و فیڵ وئاواڵەکان**
**پیرێژنە سەر ئاسنینەکەی مێژوو**
**لە شەوگارێکی تەژەی ئەنگوستەچاوا**
**حەکایەتی ئەگێڕاوە**
**بۆ منداڵانی نەنوستوو**

**هەبوو نەبوو**
**لەژێر ئاسمانێکی شینا ، لەپاڵ رەوەزێکی سوورا**
**نزیک نزیک ، نەک لە دوورا**
**شێرێک ئەژیا ، تا لەسەری دانێی پیاو بوو**
**پشت و پەنای هەرچی دەعبای لێقەوماو بوو**
**روو بە نەیار گوڕی و چڕی**
**ئای کۆنە راوچی هەڵبڕی و**
**رووبەڕوو کەس پێنەوێرا**
**کەچی ئاخری**
**بە جاڵە بەردی گزەیەک**
**لە پشتەوەڕا هەڵدێرا!**

١٣٦٩/١٢/٢٣

پێشوازی لە شێعرێکی خوالێخۆشبوو
خوشکە «ژیلا حوسەینی»یە

## جەزبەی یادێک

**یادێک وتی**
**دڵ نامرێ**
**من دڵ هەزار جاری کوشتووم**
**ناخی خەڵکی تازیەبار بوو**
**لەو فرمێسکانەی پی رشتووم**
**ئاخ چەندێکی بە شوێن هیچ وتراوکەدا[1] ماندوو کردم**
**ئێستا لوێچێ تاسەی تێکرماوی وردم**
**کەچی هێشتا دەس لە لاشەی ساردەوە بووم**
**هەڵناگرێ**
**دیسانەوە رووی لێناوم**
**وەک دەروێشی جەزبەگرتوو**
**بۆ سەرچۆپی، لەگەڵ بڵێسە ئاگرێ!**

١٣٧٠/٥/٧

[1] – تراویلکە؛ سراب

## لە قاودان

**هۆ هەوری رەش!**
**ئەشکی تیمساح رشتن بەسە**
**خۆر بە زیندوویی دەنێژی و**
**فرمێسکیشی**
**بۆ دەڕێژی**
**بە دەلەسە؟!**

ساروقامیش ـ ١٣٦٨/٧/٤

پێشکەش بە پەڕەمووچی کاک محەمەد ڕۆستەمزادە

## بوومێکی پایزی

**فرچەی خەزان**
**گەر ئەمجارە**
**لە خولیای کۆچت هەڵگرێ**
**هارمۆنی و ڕەنگی پەژارە**
**گوڵم ڕەنگە ئەوسا بڵێم**
**دڵم بوومی ئێوارەکەی**
**دڵتەنگی پایزە هەوارە!**

**١٣٧١/٦/٦**

## یاد

یادی بەخێر
ئەو دەمەی کە تازەلاو بووم
باخچەی هاوسێ ماڵەکەمان
نەمامە گەشێ قژکاڵی بە نازەوە لێروابوو
بە رۆح شەیدای کێشکچیەتی باڵای بووم
شەو بە خەونی بەرگرتنی
بۆ میوانی بەهەشت ئەچووم
هەتا بە ئێوارەکەکی وەیشوومە لێدراوی پایز
باخەوانی نامۆی دڵڕەق
نەمامەکەی بە پەلکە راکێشا بەرەو
باخی بەردەلان و تەقتەق
ئێستا لە کوێستانی تەمەن کڕێوەیە
مەلی لاویم کەسیرە بۆ گەرمێنی بێگەڕانەوە بەڕێوەیە
رەشەبای نەهاتیش هەرچەند
زۆر شەنگەداری هیوامی لە ریشەوە دەرکێشاوە
کەچی بۆ هیچیان ئەوەندەی
ئەو نەمامەی بە تالان چوو
دڵ بە دەم کزەی سەختەوە نەئێشاوە
ئێستاش برووسکەی یا دەکەی
هانای ئەسرینی لێشاوە!

١٣٧٢/٧/٢٧

## سوێند

سوێندم پێمەخۆ فریشتە
خەرمان کەزیە زێڕینەکەت
دەستەخوشکی «ئاورکەدە»کەی زەڕدەشتە
نە شەجەرەنامەم لایە و
نە لە مێژووشم بیستووە
ئەی نەتدیوە
چۆن لە سایەی ئەو بڵێسەی نەورۆزانە
پێت بەخشیوە
موغئاسایی رۆحی شێعرم کۆیلەی گڕە و
هەستم بە ئاگر نەخشیوە!

١٣٧٢/١٢/٥

## ئیلهام

**لەو رۆژەوە**
**بە پیلانێک**
**پەڕپەڕۆکی باخی بەهەشت**
**لە زێدە خۆشەویستەکەی ئاوارە بوو ـ**
**ـ رۆح بە قوڕی جەستەدا چوو! ـ**
**ئەو درامە دڵتەزێنەی «دوورە ئازیز»**
**هۆی سەبووری گوڵاڵەسوورەیە کەوا**
**بە شەوانی وەیشومە لێدراوی پایز**
**زللەی زریان تا بەیانی چاوەکانی زووڕاندەوە و**
**ژیانی بوو بە دیوانێک**
**لە هەزار غەزەلی گریان!**

**٧٣/٨/٢٧**

## هەڵەبجە لە دادگای موعجیزەدا

ئەو بوولێڵەی وا رەشەباکەی نەهاتی
بە نێزەی تیژی کاتەوە ئالآی تاوانی ئەشەکان
رانەچەتەی لە هەموو هەستی ئینسانی بێبەشەکان
نەخشەی برینی خەێنەی بزەی ساوا و تاڵانی کاروانی
دڵیان بەرێوە برد
رۆحی نوێ بەهارەکەتیان لەسەر خاچی گێژەڵووکەیەک
ژاراوی
چوارمێخە کرد
لە کۆستی دایکە حەوادا
هەتاو تانەی خۆرگیران کەوتە سەرچاوی
فریشتەکان سەبووری باوە ئادەمیان نەدایەوە ـ
ـ بۆ هابیلێکی بە ناهەڵ کوژراوی
چاوی شینی عەرشی خواش، لەو سەرەوە پەشۆکاوی
هەر ئەوساتە پشووسوارە
کە دڵی کفنپۆش ئەکرد. کرێوە بەفری پەژارە
بەرماڵی خەمی مرۆڤیان بە شانەوە، مچوڕکی وەحی
دەیگرتن ـ
پێغەمبەرەکانی خوا

**هەرکامەیان بە زمانی حاڵ**
**پەشێو لەگەڵ ئۆمەتەکەی خۆیا ئەدوا**
**ئیبراهیمی خەلیل فەرمووی: ئیسماعیلێکی دیکە بوو ـ**
**ـ بەرەو قوربانگە دەڕۆیی بە دەستوبرد**
**خوایە ئەی بە چەقۆی قەزا ئاوا تیژە**
**لە گەردەنی قوربانیەکەی نەزری بەیتولحەرامی کورد؟![1]**
**ئەییوب چەمی سەبری دایدەهات وشکایی**
**زمانی شکاوی ئەسرین پاڕایەوە:**
**ڕۆژەڕەشی ئەمجاریش نایە کۆتایی؟!**
**گۆچانەکەی مووسا هێندەی هەژدیهایەکی بێئامان**
**لە ئاستی سێحر عاسیە**
**ئەها! دیسان جادووگەران هەڵەسوونیان هێنایەوە وـ**
**ـ ئەم هەرێمە بست بە بستی**
**ڕەوەماری ژارە دووکەڵ، خونکاری کێو و شاخیە!**
**لە بڵێسەی ئەو ڕووداوە، ئاورگەکەی باوەگوڕگوڕ ـ**
**ـ دڵی زەردەشت پێغەمبەرە**
**بیری پاک و ـ**

---

[1] – خوالێخۆشبوو «عەبدوڵڵا نیروومەند (ئاواڵ)» دەڵێ:
ئاواڵ حەرامی کردووە ماڵی خوا لە خۆی
تاکوو نەکا زیارەتی بەیتولحەرامی کورد!
١٣٢٢ هەتاوی

ـ وتەی تاک و
چاکی دەوێ لەم بەشەرە!
مەسیح لە خەمی دەرماندا
بە ئەستەم دەیکێشا پشوو
ئاخر لە پاش زامەکەی خۆی
بە تەنێ لە هێرۆشیما ، برینێکی کەی وای دیبوو!
یا موحەممەد!
عەداڵەتە تاقانەکەت ـ
ـ بۆ کام پەسلان
ئەورۆکانە
لەبەرچاوی میلیاردێ کەس موسوڵمانا
پێنج هەزار کۆتری سپییە ـ
بە رۆژێ دەرمانداو کراو
بە گڕکان و هەورە تریشقەی شیمیایی
گۆنای زێد ، چاوی عاسمان و
قژی هێلانەیان سووتاو؟!

١٣٧٤/١٢/٢٥

پێشکەش بە «وێنە»ی کاک مارف ئاغایی

## ئاوڕ

**حەزرەتی نالی ـ**
**ـ لە دووری**
**حەبیبەکانی شارەزووری**
**بە حەنجەرەی سەید ئەسغەری**
**ئاگراوی غەزەلییەوە**
**بەشی هەموو غەریبەکان**
**هەتاکوو بەیان بەردانی شەوە تاریکەکەی غوربەت**
**ئەناڵێ بە درێژەی ساڵێ**
**حافزی مەزن لە هەر کوێ کە دڵێکی تەنگی بینی**
**دەس دەبا بۆ دیوانەکەی بە نیازی شێعرە فاڵێ**
**تازە وەک وان کەس بە تەنگی خەمی ئینسانەوە ناژی بۆ**
**هەتا هەتایە**
**کەچی منیش لە دوای ئەوەی کە دەشمردم**
**هەمیشە یادیان ئەکردم**
**ئەگەر بێتوو خەتێ وام دابهێنایە**
**غەزەلی حەماسەی جوانی ـ**
**ـ ئەم ئێوارەی ئاوڕی تۆی نیشتمانم لە چاپ دایە**
**حەیفێ «خەتە تەسویریە» کەی «فلاش» و «کامێرا»ی.**
**ئەورۆ**
**بۆ مەبەستم**
**سەدان قەڕنی کەش لە دوایە!**

ئێوارەی ١٣٧٤/٦/١٤ ـ بەستێنی چۆمی جەغەتوو

پێشکەش بە تەنانەت منداڵی دیکتاتۆڕەکانیش!

## گورگە شە وێ

منداڵەکان
لەگەڵ یەکتر ئاواڵەکان
گورگەشەوێ هەتا لاوبوو
بە درێژەی تەمەنی شەوگار
بێبەزەیی
خەریکی کەو کەوەڕاو بوو
فێری ئاوی بێلغاو بوو
هێندەی ساتێ حەو کوێستانی
ئەپشکنی بە تەقلەدەو
شوانی بە پێوە لە چیا ئەکردە خەو
دووگی ئەدڕی ملی ئەشکان بەخێرایی
کەچی دوایی
چیرۆکی گورگی ئاخرشەڕ
بەم، جۆرە هاتە کۆتایی:
کاتی پیری
بوو بە گاڵتەی، سەگەلی خوێڕی ئاوایی!

١٣٧٦/١١/٢١

بۆ خاسەکەوەکەی «شێرزاد»

## کەویار

**منداڵەکان! دڵپڕە دەسبەتاڵەکان!**
**لەناو مەلانی دونیادا**
**من تەنیا کەوم خۆشدەوێ**
**با وێنەشی بە ئاڵای هیچ کوێوە نەبێ**
**لەو رۆژەوە**
**گژەی نەهاتی هەڵیکرد**
**لە بەرزایی با پەڕ و باڵی هەڵۆی برد**
**لە داخ رێوی**
**شێر لە شار بە زەلیلی مرد**
**پشووی فێڵاوییەکەی پێشووش**
**کرایە پێخۆری تەڵە**
**لەو ساوە چاخی چەقەڵە**
**کەو ئەگەرچی هێزی نەبوو**
**رێزی نەبوو**
**قەت کوێستانی بۆ نەیاران چۆڵ نەکرد و**
**بە قاسپە و پڕیشکەی خوێنی**
**بە گژ هەر راوچیەکدا چوو!**

١٣٧٨/٢/١٩

## خنکان

دەمێکەیە
کەچی ئەڵێی هەر ئەمڕۆ بوو
بە مناڵی لەسەر بەستێنی جەغەتوو
مانووی دەسبەتاڵی راوبووم
هاودەمی پۆلەقاشەیەک
بێئۆقرەی مەلەی گۆڵاو بووم
دایکم هەزار جار پێوتم:
«هەتاکوو خوار خۆی کەت ئەبا
جەغەتوو ئامانی نییە
رۆڵەی نەکەی توخنی کەوی!»
خۆم پاراست
هەتا گەورە بووم
کچی چاوشینی سەرسنوور!
نیگات شەپۆلی شینی نارد بەرز و نەوی
بە راست گەڕا
پێت وتبووم دایە ئەوی...!
بەستێنی جەغەتوو
ساروقامیش

٢٠ی گولانی ١٣٧٧